# ڕەمز و نووسینی سەرگۆڕەکان

## بەنموونەی چوار گۆڕستانی باشووری کوردستان


نووسینی

ئەرخەوان محەمەد عوبێد





دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- ڕەمز و نووسینی سەر گۆڕەکان
نموونەی چوار گۆڕستانی باشووری کوردستان
- **نووسینی:** ئەرخەوان محەمەد عوبێد
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی
- **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
- **پیتچنین:** کارزان
- **ژمارەی سپاردن:** ٩٥٨
- **نرخ:** ٣٥٠٠
- **چاپی یەکەم :** ٢٠٠٨
- **تیراژ:** ٥٠٠
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٢٧٩)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## پێشکەشە بە...

- بەگیانی پاکی (( باوکم ))
- بەدایکم



## سوپاس و پێزانین...

سوپاس و ڕێزی بێ پایانم بۆ هەموو ئەو کەسە هەست بەرزانەی کە دەستی یارمەتیان بۆ درێژ کردووم، کە هانیان دام بۆ ئەوەی باوەڕم بە تواناکانی خۆم هەبێت لە ئەنجام دانی ئەم کارە بەتایبەتی (مامۆستا عزیز گەردی) و ئەندامانی ماڵەوەم و بۆ (د. نەسرین)، هەروەها پێزانین و بەرز نرخاندنی من بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لە پشکنین و سەرچاوە پەیاکردندا هاوکارم بوون و لەگەڵمادا بە گەرماو بەسەرما لەناو گۆڕستانەکاندا گەڕان بەتایبەتی بۆ سامان حسام الدین، ئاشنا جەلال، مامۆستا عبدالباسط و مامۆستا سروە، نیان و بێستون حسام الدین، میران عوسمان، دیار زرار، هێمن دڵشاد و هێمن عومر.

داوای لێبوردن لە هەموو ئەو دڵسۆزانە دەکەم کە بە هەر چ شێوەیەك بێ یارمەتیان دام و ناویانم نەهێناوە، بەڵام هەوڵەکانیان مایەی شانازی و دڵ خۆشییە، چونکە واتای ئەوەیە کە هێشتا کەسانێك ماون لەم جیهانەدا گیانی یارمەتیدانیان لە پێناوی خزمەتکردن تێدایە.

# ناوەڕۆك

## مردن لای گەلان:

ئەگەرچی مرۆڤ هەتا ڕادەیەکی زۆر پابەندی ژیانەو ناتوانێ بە ئاسانی دەست بەرداری بێت و ئەگەر چی مرۆڤ بەهەر چ شێوازێك ژیان بەرێتە سەر، ئەو ژیانەی هەر خۆش دەوێت و روحی هەر لا شیرینە، بەڵام دوا جار مردن ئەو هێزەیە کە کۆتایی بە هەموو خۆشی و ناخۆشییەك دەهێنێت و هەموو شتێك دەبڕێنێتەوە، لەبارەی مردنەوە خەیامی شاعیر دەڵێ:

**مردن چییە کەس تێ نەگەیی تا وێستا**
**تەورات و زەبور تا دەگاتە ئاوێستا**
**زۆرکەس لە ژیان دواوە زانایانە**
**بۆ باسی مەرگ گێل و نەزان ڕاوێستا**[١].

مردن ئەو چارەنووسەیە کە ڕزگاربوون لە دەستی مەحاڵە.

هەر لەسەرەتاکانی ژیانەوەو لەو ساتەدا کە مرۆڤ بەرامبەر بەدیاردەی مردن بۆتەوە، دووچاری تەوژمێك لە پرسیار و تێرامان بووە، پرسیار سەبارەت بە چەمکێك بەڕووداوێك کە نامۆیە، و ڕێگایەکی مەترسی دارە، چونکە چارەنووسێکی نادیارە و لێکدانەوەشی ئاسان نییە.

کاتێ مرۆڤ بێ هیچ چارەسەرێك و دەسەڵاتێك بەرامبەر بەدیاردەی مردن وەستا، لەناخەوە ترسێکی قوڵی لەلا پەیدا بووەو هەوڵی خۆ ڕزگارکردنی داوە لەم چارەنووسە. بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش گەڕان بەدوای نەمریدا هاتە کایەوەو لە بارەی ئەم گەڕانانەوە بەدەیان ئەفسانەی جۆراو جۆرمان کەوتۆتە بەر گوێ، بەڵام وەکو دوا ئەنجام کەس نەیتوانیوە نەمری بەدەست بهێنێت لەبەر ئەوە خەیاڵی نەمری بەدەست هێنان هەر لە چوار چێوەی ئەفسانەدا مایەوەو بە ناچاری مرۆڤ دانی بە دیاردەی مردن دانا وەکو تاکە چارەنووسێك کە کەس لە گێژاوەکەیدا ڕزگاربوونی بۆ نییە.

ئەو خاڵەی کە هەموو کەس لەسەری کۆکە ئەوەیە کە مردن دوا وێستگەی ژیانە، بەڵام هەر کۆمەڵێکیش بەپێی بیرو بۆچوون و ئاین و شێوازی بیرکردنەوەی خۆیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەم دیاردەیەو دەورووبەرەکەی کردووە، لێرەدا تەنها باس لە مردن دەکەین پاشان باسێکی

(١ ) چوارینەکانی خەیام، و. هەژار، چ٢، چاپخانەی سروش، تهران، ١٩٩١، ل٤.



کورتی ئەو چەمکانەش دەکەین کە لەدیاردەی مردن دەکەونەوە وەکو چارەنووسی مردوو، بوونی جیهانی پاش مردن، و گۆڕ... هتد.

مەرگ و دابڕان دوو چەمکن هەمیشە بە یەکەوە دێن، مەرگ دابڕانە لە خۆشەویستەکان جا چ بۆ مردووە کە خۆی یان بۆ کەس و کاری مردووەکە کە ئازیزێکیان لەدەست دەچێ.

مەرگ لەناوچوونە، سڕانەوەی ناوێکە لە دەفتەری ژیان، سەندنەوەی هەموو وزەو توانایەکە لە کەسی زیندوو، مردن دۆخێکە پێچەوانەی ژیانە.

لەلای سۆمەرییەکان مردن وەکو سزایەکە، نەفرەتێکە لە تاوانێکی بێ مەبەست، مردن دووچاری (ئەنکیدۆو گلگامش) دەبێتەوە، چونکە ئەوان لە فەرمانەکانی خواوەند (عشتار) دەرچوون و گای ئاسمانیان کوشت، هەروەها خواوەندەکان بڕیاری مردن لەسەر (ئادابا)و دارو و دەستەکەی دەردەکەن چونکە لە چرکەیەکی توڕەییدا نەفرەتی بای باشووری کردووەو باڵی شکاندوە... هتد[٢].

هەر لەلای سۆمەرییەکان بیرۆکەی مردن و هەبوونی ژیانێکی تایبەت بە مردووەکان بەردەوام لە ئارادابووە. بەلای ئەوانەوە جیهانێك هەبووە بەناوی جیهانی ژێرەوە کە جیهانی مردووەکان بووە، و تەنانەت خواوەندیش لەم جیهانەدا هەبووە بەتایبەتی خواوەند (انليل) و ئەم جیهانە بەدۆزەخ یا جیهانی ژێرەوەی مردووان ناسراوە[٣]. واتە: هەر لە کۆنەوە دیاردەی مردن سەرنجی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەلای خۆیەوە ڕاکێشاوە، مرۆڤیش ئەم پرسیارانەی لە خۆی کردووە: ئایە مردن چییە؟ و پاش مردن چی هەیە؟ و کە مردن کۆتایی ژیانە ئەی پاشان چی؟ ... هتد. هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەش بۆتە هۆی سەرقاڵ بوونی فەیلەسووف و بیرمەندەکان، تەنانەت شاعیرەکانیش بەم مەسەلەیەوە خەریك بوونە، ئەگەرچی لەمانە کەس نەیتوانیوە یەك لای بکاتەوەو شتێك بدات بەدەستەوە کە جێگیرو نەگۆڕبێت، بەڵکو هەوڵی هەموویان تەنها لە چوار چێوەی گریمانەو بۆچوونی تایبەتیدا ماوە، چونکە هیچی بە بەڵگەی لۆژیکی یان زانستی نەسەلمێنراوە، لەبەر ئەوە جیاوازی لە نێوان پێناسەکانی مردندا دەبینین. (دەروونناسی عەقڵی "ڕێی مۆند موودی") مردن بە ڕووناکی لەناکاو وەسف دەکا. لەلایەکی

(٢) الاسلام وملحمة الخلق والاسطورة، تركي علي الربيعي، المركز الثقافي العربي، بيروت، ١٩٩٢، ص٤١.

(٣) طقوس الجنس المقدس عند السومريون، صموئيل نوح كريمو، طـ٤، دار علا و الدين للنشر، سورية، دمشق، ٢٠٠٦، ص٢٢٤.

تر زاناکان مردن بەم جۆرە وەسف دەکەن و دەڵێن: دەراسەیەکی مەنگ و مۆنە لە پڕێکا خۆشەویستەکانمان دەبڕێتەوە[٤].

جا ئەو قسانەی لەبارەی مردنەوە کراوە زۆرەو کۆتایی نایەت، ئەگەرچی کەسیش بۆی نەکراوە شتێك وەکو ڕاستییەکی ڕەها لە بارەی مردنەوە بدوێت. مردن کە دابڕانی کەسێکە لەژیان، ئەو دابڕانە کار دەکاتە سەر سۆزو دەروونی خەڵك و چۆنیەتی ئەم کارتێکردنە لەو داب و نەریتەدا دەردەکەوێ کە لەکاتی مردنی کەسێکدا ئەنجام دەدرێ جا بە هەر شێوازێك بێت.

زۆر جار ئەو کارتێکردنە لەناو شیعری شاعیرانیش ڕەنگدەداتەوە بۆ نمونە: لەسەردەمی جاهیلی لەناو شاعیرانی عەرەبدا زۆریان بە مردن و شیوەن کردنی مردوودا وتووەو لەناو هۆنراوەکانیاندا ناوی (مردن) یان بە وشەی (الحق) هێناوە (النمر بن تولب) دەڵێ:

"الم تران جمرة جاء منها بیان الحق لو نفع الکلام"[٥].

هەروەها لە ئاینی ئیسلامیشدا مردن بە حق ناو دەبرێ و بە قەدەرێك دادەنرێ کە هەموو کەس دووچاری دەبێتەوەو بە ڕێگایەکی دوورو درێژ دەشوبهێنرێ ئەو ڕێگایە یان زۆر سەخت و ناخۆشە یانیش ڕێگایەکی سووك و خۆش و ئاسانە، خودا لە قورئاندا دەفەرمووێ: (**قد افلح من زکها وقد خاب من دسها**) (الشمس/ ٩-١٠) هەروەها مردن کات و شوێنی دیاری کراوی نییە (**وما تدري نفس ماذا تكسب غداً وما تدري نفس بأي ارض تموت**) (لقمان/٣٤) و ڕاکردن و خۆشاردنەوەش لەدەستی مردن بێ ئەنجامە (**یدرککم الموت ولو کنتم في بروج مشیدة**) (**النساء/٧٨**).

هەر لەم بارەیەوە پیرەمێرد لە دێرە شیعرێکیدا دەڵێ:

**خوا فەرمووی ئەگەر لە قەڵاشدا بن**
**ڕزگاری نییە لە چەنگی مردن**
**ئەمە بە چاوی خۆمان ئەبینین**
**کەچی بە مردن ئیمان ناهێنین[٦].**

(٤) هۆشیاری دوای مردن، مارلین شلیتز، و. گۆران صباح، گـ. کاروان، ژ: ١٧٨، هەولێر، ٢٠٠٤.

(٥) الحیاة والموت في الشعر الجاهلي، د.مصطفی عبداللطیف جیاوك، منشورات وزارة الاعلام، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ص١٦٧.



هەروەها دانیشتووانی باشووری کوردستانیش هەر وەکو میشییەکان لەژێر کاریگەری ئایینی خوریەکاندا ئەو باوەڕەیان لەلا دروست بوو کە هێزێکی خوایی هەیە دەست دەخاتە چارەنووسی مرۆڤەوە دەیمرێنێت و زیندووشی دەکاتەوە، پاش هاتنی ئیسلامیش ئەم بیرە چەسپا، و ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ڕابردوو بۆمان دەردەکەوێ کە کوردیش لەسەردەمی زەردەشت و پاش و پێشی ئەویش هەڵسوکەوت و تێفکرینی تایبەتیان لە بارەی مردنەوە هەبووە، کە ئیسلامیش باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا ئەو هەڵسوکەوتە گۆڕانی بەسەردا هات، واتە لەگەڵ گۆڕانی ئاین و ئاستی بیرکردنەوەدا هەڵسوکەوت و تێڕوانینەکانیش گۆڕانیان بەسەردا دێت.

هەروەکو باسمان کرد دیاردەی مردن کار دەکاتە سەر هەست و سۆزی خەڵکی و بەتایبەتی لای شاعیرەکان زۆر بەزەقی دیارە، چونکە ئەو کارتێکردنە لە شیعرەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە، زۆرجار شاعیر شیعر بۆ کەسە ئازیزەکانی دەنووسێت کە مردن دەرگا لەسەر ژیانیاندادەخات، یاخود هەر لەچوار چێوەی چەمکی مردندا باس و تێڕوانینەکانی خۆیان سەبارەت بە ژیان دەردەبڕن. هەروەها هەموو جۆرە دابڕانێك دەگەڕێنەوە بۆ سەر مەسەلەی دابڕانی مردن. (مەحوی) شاعیر لەدێرە شیعرێکیدا داوای مردن دەکات چونکە دابڕاوە لە کەسە ئازیزەکانی و دەڵێ:

**بەجێ ماوم لە یاران، نابەجێ ماوم، ئەجەل زووبە**
**بە مردن لەم قوصوری ژینە ئیستعفانەکەم، چبکەم[٧].**

مەولەویش دەفەرمووێ:

**مەعلوم ئالای یەکی حەیاتە**
**بەڵێ ئالای گشت ئالای مەماتە[٨].**

(٦) لە پەندەکانی پیرەمێرد، کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی کاکەی فەلاح، چاپخانەی سلمان الاعظمی، بغداد، ١٩٦٩، ل١٢١.

(٧) دیوانی مەحوی، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریم مدرس و محمد مەلا کەریم، چ٢، بڵاوکراوەی کوردستان، ایران، ؟، ل٢٣٣

(٨) عقیدەی مرضیة، دانانی سید عبدالرحیمی مەولەوی، شرح و لێکدانەوەی: مەلا عبدالکریم مدرس، مطبعة الخلود، بغداد، ١٩٨٨، ل٥٩٣.

لە ئەدەبی میللی هەوراماندا هاتووە کە گوایە هەر مرۆڤ و گەڵایەکی هەیەو ژیان درەختی پڕ لە گەڵای مرۆڤایەتییە، هەر کەسێ مرد گەڵایەك لەو دارە بەرامبەر گیان دەرچوونێك دەکەوێتە خوارەوە.

ئانا من مردا قاڵم بڕیاوە گەڵاو جوانیە کێم جەدار کیناوە[٩].

ئەگەر شۆڕبینەوە بەناو قوڵای مێژوودا لەناو هەر ئایینە و هەر میللەتێك تێگەیشتنی جۆراو جۆرمان لەمەڕ کێشەی مردن و چارەنووسی لەش و گیان... بەدەست دەکەوێ، بەڵام ئەوەی دەشێ بوترێ لەسەر چەمکی مردن بێگومان زۆرە، چونکە خۆی دیاردەیەکی ئەفسوناوییەو لەلایەکی ترەوە لەڕێی عەقڵییەت و بیرکردنەوەی جیا جیاوە باسی لێوە دەکرێ، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە هەموو ئایینەکان و نەتەوەکان بۆیان سەلماوە کە مردن دیاردەیەکە قەدەری مرۆڤەو مرۆڤ خۆی بێ دەسەڵاتە لەبەرامبەریدا جا ئەوەی ئەمێنێتەوە بۆ گفتوگۆکردن و قسەو باس لەبارەیەوە ئەو دیاردەو هەڵسوکەوتانەیە کە بەدیاردە سەرەکییەکەوە (مردن) لکاون، ئەم دیاردانەش بیرو بۆچوونە لەسەر ژیانی پاش مردن و چارەنووسی لەش و گیان و بوونی دۆزەخ و بەهەشت و گۆڕستان و... هتد. ئەمەش بە پێی بڕواو و بیرکردنەوەو تێفکرینی جیا جیاوە لەلایەن میللەتەکانی جیهانەوە، (خیام) دەڵێ:

**ئەم بوون و ژیانەی هەیە چۆن ڕووی داوە؟**
**ئەنجامی چییەو بۆ چییە، چی بەدواوە؟**
**هیچ کەس نەبویە و نیشە بەراست بیزانێ**
**هەرکەس بە خەیاڵ شتێکی بۆ هەڵداوە**[١٠].

لە بەشەکانی داهاتوودا هەوڵدەدەین لە بارەی ئەو بۆچوونانەوە بدوێنین.

(٩) کێشەی مەرگ لای مەولەوی، سروە عوسمان، گ: ڕامان، ژ٧٩، هەولێر، ٢٠٠٣.

(١٠) چوارینەکانی خەیام، ل٧٥.



## چارەنووسی لەش پاش مردن:

زۆر کەس چیرۆکی قابیل و هابیلی بیستووە، کاتێ قابیل هابیلی بۆ رای دەکوژێ و پاشان نازانێ چی لەلاشەکەی بکات و لە پڕێکا خوای گەورە دوو قەلەڕەش دەنێرێ و لەبەر چاوی قابیل شەڕ دەکەن و یەکیان ئەوی تر دەکوژێ و پاشان لە زەوییدا هەوڵی شاردنەوەی دەدا، جا گوایە قابیلیش لە مەوە فێردەبێت و لاشەی براکەی (هابیل) لەناو خاکدا دەشارێتەوە. دەکرێ ئەم چیرۆکەی (قابیل هابیل) بە هەنگاوی سەرەتا دابنرێ بۆ فێربوونی شاردنەوەی لاشەی مردوو لەلایەن مرۆڤەوە، ئەگەرچی شاردنەوەی مردوو لەناو خۆڵدا تاکە چارەنووسێك نییە بۆ لاشەی مردوو، چونکە زۆر هەڵسوکەوتی دیکەی لەگەڵدا دەکرێت، دیارە زۆر کەس ڕێککەوتووە لەسەر ئەوەی لەش فانییەو (بەقا) مانەوە تەنها بۆ گیانە، ڕێو ڕەسمی ئەم فەوتانەو چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ جەستەدا لە پاش مردن بەپێی داب و نەریت و ئاین و باوەڕی میللەتەکان دەگۆڕێ.

ئاشکرایە لە ناو ئەو میللەتانەی کە پەیڕەوی ئاینی ئیسلام دەکەن بە کوردیشەوە کە مردوویەکیان لێ دەمرێت بەپێی ڕێ و شوێنی ئاینی ئیسلام ئەو مردووە دەشۆردرێت و کفن دەکرێت و پاشان لەناو چاڵێك لە خاکی دەنێن ڕوو بەرەو قیبلەو بە خۆڵ دایدەپۆشن و بەم شێوەیەش ئەم لاشەیە لە دەستی ئاژەڵ و سووکایەتی کردنی مرۆڤەکان ڕزگاری دەبێت و لەناو گۆڕدا دەبێتەوە بە خۆڵ، ئەم گۆڕەش کە مردووی لە خۆگرتووە هەڵدانەوەو سووکایەتی پێ کردنی جائیز نییە، بەڵکو ڕێزگرتن لە پاك و تەمیزی گۆڕو گۆڕستان پێویستەو بەبێ گوێدانە مێژوویی ژیانی مردووەکان (**الموت هو المسوي العظيم بين جميع البشر**)[١١].

جا ئەم جەستەیە لەو گۆڕەدا دەمێنێتەوە هەتا ڕۆژی حەشر، هەندێك لەو باوەڕەدان کە لەناو گۆڕەکە لاشەکە سزا دەدرێ ئەگەر مردووەکە کەسێکی خراپ بووبێت، بە پێچەوانەوەش دەبێتە باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت بۆ مرۆڤی چاك، بەڵام هەندێکی تر باوەڕیان بەوەیە کە حساب و کیتاب لەڕۆژی مەحشەردا دەبێت و گۆڕیش تەنها بۆ پاراستنی لاشەی مردووەکانە، ساغ بوونەوەی ئەم ڕاستیانە بۆ مرۆڤ کارێکی ئاسان نییە و لەدێر زەمانەوە بۆتە جێی گفتوگۆی فەیلەسووف و ئاینزان و بیرمەندەکان. جگە لەمەش بیری زیندووبوونەوەی پاش مردن لەلای زۆر کەس هەبووەو هەیە، بەڵام ئەم زیندووبوونەوە چۆنەو چۆن نییە و ئایە

(١١) پەندی بەراوردکاری، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە، کریم شارەزا، چاپخانەی (سمیر امیس)، ١٩٨٣، ل٧١.

مردووەکە بە گەنجی بە پیری بە منداڵی زیندوو دەبێتەوە ئەمیان جێی گفتوگۆکردنە و کەس هیچ لە بارەیەوە نازانێ، ئەگەرچی لەلایەکی ترەوە کۆمەڵە کەسانێکی تر هەن کە هەر لە بنەڕەتەوە باوەڕیان بە زیندووبەنەوە نییە وەکو مادییەکان کە روح بە چالاکی شانەکانی لەشی مرۆڤ دادەنێن و هەرکە لەش نەما روحیش نامێنێ و جارێکی تر زیندوو نابێتەوە. ئەوەی گرنگە بەلای ئێمەوە ئەوەیە کە هەموو میللەتانی ئیسلامی لەگەڵ لاشەی مردوودا هەمان ڕەفتار دەکەن و دەینێژن بەپێی سونەت و مەزهەبەکان، هەروەها لای ئایینە ئاسمانییەکانی دیکەی وەکو جوولەکە و مەسیحیش لاشەی مردوو دەنیژرێ زۆرجاریش بە تابووتەکەوە دەنرێتە گۆڕو لە گۆڕستانی تایبەتی خۆیان دەنێژرێن.

ئەوانەی پەیڕەوی ئایینی یەزیدیش دەکەن لە کۆنەوە کاتێك مردوویەکیان لێ دەمرێت بە جوانترین جل دەیپۆشن پاشان کفنی بۆ دەکەن و سێ ڕۆژ لە ماڵدا ڕایدەگرن، بەڵام ئەنجام ئەوانیش بەرەو گۆڕستانی دەبن لەوێ دەینێژن. پاش سێ ڕۆژیش مەڕێك سەر دەبڕن و دەیبەنە سەر گۆڕەکە گوایە مردووەکە پێویستی بە خواردنە[١٢].

صابئەکانیش پاش سێ کات ژمێر لە مردنی کەسێکیان مردووە کە دەشۆرن و کفی دەکەن و لەو شوێنە دەنێژرێ و نابێت لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر بگوازرێتەوەو لەکاتی ناشتندا مردووەکە لەسەر پشتی پاڵ دەخرێ و دەموچاوی و پێی بەرەو ئەستێرەی گیسك (الجدی) دەبێ، و هەندێك خۆڵ لەدەمی مردووەکە دەنێن لەو خۆڵەی کەهی دەمی یەکەم خاکەناسە، کە بۆ قەبرەکە لێ دەدرێ[١٣].

خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی شارستانییەتەکانی بابل و میسر و دەورو زەمانی ئەکەدی و ئاشوری و فرعەونییەکان و... هتد، بۆمان دەردەکەوێ کە زۆربەی ئەو میللەتانەش مردووەکانیان ناشتووە، جیاوازیش تەنها لەو داب و نەریتە دایە کە پەیڕەو کراوە، بەڵام زۆربەیان لەگەڵ بیرۆکەی ناشتنی مردوودا تەبابوون.

لە ئەفسانەی گلگامشدا گوایە کە ئەنکیدۆ دەمرێ گلگامش دووچاری سەرسوڕمان و ترس و نارەحەتی دەبێ و نایەوێ خۆشەویستەکەی کە ئەنکیدۆیە بە جێ بهێڵێت، لەبەر ئەوە حەوت

(١٢) ئیزیدیەکان، سدیق بۆرەکەیی، گ، رامان، ژ٢٥، هەولێر، ٢٠٠٠.

(١٣) موسوعة العقائد والادیان، مازن مغایري، دار الرضوان، حلب، ٢٠٠٤، ص٩.



ڕۆژان دەیهێڵێتەوە، بەڵام لاشەکەی کرم هەڵدێنێ جا ئەم تێکچوونی لاشەیە بووە هۆی ئەوەی مرۆڤەکان بیر لە چارەسەرێك بکەنەوە بۆ مردووەکانیان.

(بابلییەکان ناخۆشترین سزا لەلایان نەناشتنیان بووە لە پاش مردندا، چونکە پێیان وابوو کە گیانیان هەمیشە نا ئارام دەبێت و لەبێ ئارامیدا دەمێنێتەوە)[١٤].

هەر لەبارەی سۆمەرییەکانەوە گوایە بەجیهانی ژێرەوەیان وتووە (کور kur) کە جیهانی مردووەکانەو مانەوەی گیانی مردووەکان لەوێ ئەبەدی دەبێ. و بەپێی باوەڕی ئەوان پەیوەندی نێوان روح و لاشە دوای مردن ناپچڕێ و دەمێنێ، و چەند لاشەو جەستەکە ئارام و جێگیر بێت ئەوە دڵنیایی و ئارامی دەداتە گیانەکە، بەڵام گۆڕ هەڵکەندن و بڵاوکردنەوەی ئێسکەکانی مردوو ئەوە روحەکە ئازار دەدات و نا ئارامی دەکات[١٥].

دیارەکە ئەکەدی و ئاشوری و بابلییەکانیش کە مردوویان ناشتووە، خستویانەتە ناو گۆڕەوە. ئەو گۆڕەش لەسەر شێوەی ژوورێك بوو لەژێر زەوی هەڵدەکەندرا. زۆرجار کەرەستە تایبەتییەکانی مردووەکە دەخرایە ناو ئەو ژوورەوە لەگەڵ لاشەکەدا. جا ئەگەر مردووەکە پاشا یان خاوەن سامان بوایە ئەوە گۆڕەکەشی دەوڵەمەندتر دەبوو و ژورێکی بەرین تری بۆ دروست دەکرا، زۆرجایش کۆمەڵێك لە دارو دەستەی پاشا خۆیان دەکرد بە قوربانی و ژەهریان دەخواردەوە تاکو لەگەڵ پاشاکانیان بنێژرێن بۆ ئەوەی لە زیندوو بوونەوەشدا هەر لەگەڵ پاشاکەیان بن. ڕیشەی ئەم نەریتە بەزەقی لەلای مسرییەکان دەست دەکەوێ. کەس نییە فیرعون و گۆڕستانەکانی فیرعون و ئەهراماتی نەبیستبێ، ئەو داهێنانە بەرزانەی کە مرۆڤ کردوویەتی بەماڵی مردن.

ئەمەش بەهۆی بوونی بیرۆکەی ژیانی پاش مردن بووە. میسرییە کۆنەکان مردووەکانی خۆیان ناشتووە بەر لە هەزار ساڵ لەوەی پاشاو شارستانییەتیان هەبێت و لەگەڵ ئەم مردووانەدا ئەو کەرەستانەی کە ڕۆژانە مردووەکە بەکاری هێناوە خراوەنەتە ناو گۆڕ، کەرەستەکانیش بریتی بووە لە ئامێرەکانی ڕاوو هەروەها ئەو ئامێرانەی کە بۆ بەرگری کردن بەکاری هێناوەو.. هتد. بەڵام کاتێ شارستانییەت لەلایان پەیدابوو، بوون بە خاوەن پاشاو سامان، ئەو کەرستانەی

(١٤) الاسلام وملحمة الخلق والاسطورة، ص٣٩.

(١٥) مەرگ و دۆزەخ لە هزرو شارستانیەتی میسۆپۆتامیادا، محمد سلێمان عباس، گ، شانەدەر، ژ١٤، هەولێر، ٢٠٠١. ل ؟.

لەگەڵ مردوودا دەنێژرا زۆر بوون. هەر لەبەر ئەوە گۆڕی مەزن و گەورەیان بۆ مردووەکانیان دروست کرد. میسرییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە مردووەکان لەژیانێکی تر دەژێنەوەو لە شوێنێکی تر دوور لە گۆڕو لاشەکە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی پەیوەندی بپچڕێنن لە نێوان لاشەی ناو گۆڕەکەو ئەو ژیانەی تر و نەیانتوانی بیر لە نەمری مردووەکانیان بکەنەوە لە ژیانێکی تایبەتیدا بێ بوونی جەستەکانیان، لەبەر ئەوە هەوڵیان دەدا بەجوانترین شێوە لاشەکان بپارێزن بەتایبەتی لاشەی پاشاکانیان تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی گۆڕی زۆر دەگمەن و بە نرخ و نایابیان دروستکرد کە ئەمڕۆ پێیان دەوترێ (اهرامات) هەر بەمەوەش نەوەستان، بەڵکو بۆ پاراستنی جەستەکە دەستیان کرد بە مۆمیاکردنی مردووەکان ئەمەش بۆ ئەوەی لاشەکە تێك نەچێت و لەکاتی زیندووبوونەوەدا جەستەکە وەك خۆی بێت و تێك نەچووبێت[١٦].

هەروەها ئەو مرۆڤانەی نیاندرتالیش کە بەسەدان هەزار ساڵ بەر لە ئێستا ژیاون مردووەکانی خۆیان ناشتووە. هەر بۆ نموونە لە شانەدەر نۆ پەیکەری ئێسکی دۆزراونەتەوە کە حەوتیان هی مرۆڤی گەورەن و دوانیان هی منداڵن لە جۆری مرۆڤی ناسراو بە نیاندرتال، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ناشتنی مردووەکانیان[١٧].

ئەوەی لەبارەیەوە دوایین هەمووی جۆرێك بوو لە چارەنووسی لەشی مرۆڤ لە پاش مردن، بەڵام جگە لەوەش کۆمەڵێك هەڵسوکەوتی تر کراوە لەگەڵ لاشەی مردوودا هەر لەدێر زەمانەوە، و ڕەنگە هەتاکو ئێستاش ڕیشەی هەندێك لەو نەریتانە لەناو میللەتەکاندا مابێتەوە.

هەندێك لێکۆڵینەوە لە دامێنی گردی شێخ حەسەن لە باشووری ڕۆژئاوایی پردی کۆنی قەڵاچوڵان ئەنجام دراوە، و هەندێك کوپە قەبر دۆزراوەتەوە کە خۆڵەمێشی سپی تیادا دۆزراوەتەوە، ئەم خۆڵەمێشە خۆڵەمێشی مردوو بووە، و لەزۆر جێگای تر ئەم کوپە قەبرانە دۆزراونەوەتەوە کە خۆڵەمێشی مردووی تیادا بووە بۆ نموونە: لەدێی (قازان)ی باشووری ڕۆژئاوایی سلێمانی ئەم کوپە قەبرانە دۆزراوەتەوە[١٨].

(١٦) انتصار الحظارة (تاريخ الشرق القديم) جيمس هنري برستد، ت/د. احمد فخري، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٦٦، ص٩١.

(١٧) گەڕان بەدوای نەمرییدا، مەولود ابراهیم حەسەن، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢، ل١٠١.

(١٨) قەڵاچوڵان پایتەختی میرنشینی بابان، عبدالرقیب یوسف، گ؛ هزار مێرد، ژ ٢١، سلێمانی، ٢٠٠٢.



دیارە سووتاندنی لاشەی مردوو نەریتێك بووە لەناو وڵاتی میسۆپۆتامیا، بەڵام ئەم نەریتە زیاتر لای هیند و چین و بوزیەکان باو بووەو لە زۆر شوێنی دیکەی ئەم جیهانەشدا پەیڕەو کراوە.

نەریتی لاشە سووتاندن لە زۆر شوێنی هیند و چیندا هەتا ئێستاش ماوەو لە هەندێ ناوچەی ئەوروپاشدا ڕیشەی ئەم نەریتە هەیە، سووتاندنەکەش زۆر جار ڕێ و ڕەسمی ماتەمینی لەگەڵدا ئەنجام دەدرێ و پاش سووتاندنیش ئەم خۆڵەمێشە یان بە ئاوی ڕووبارو دەریادا دەکرێ یاخود کۆ دەکرێتەوەو لە کوپە قەبردا هەڵدەگیرێ وەکو چۆن لە کوپە قەبرەکانی قەڵاچوڵان دۆزراوەتەوە. زۆر جاریش مردووەکەیان خستۆتە سەر بەلەمێك لەناوەڕاستی دەریادا بە چیلکەدار سووتاندویانە، خۆڵەکەی بۆ دەریا بووە، یاخۆ زۆرجار خۆڵەمێشی مردووەکانیان لە پەرستگاکان یا لە ماڵەکانیاندا هەڵگرتووە... هتد. بۆ نموونە.

(مەزدا پەرستەکان مردووەکانی خۆیان سووتاندوەو زۆرجار بۆ سووتاندنی مردووش ڕێوڕەسمی تایبەتیان دامەزراندووە)[١٩].

هەر لە بارەی سووتاندنی مردووش، گوایە (بوزا) پاش مردنی، لە زەوییەکی لماوی و لەکەناری ڕووبارێك لاشەکەی دەسووتێنن و تۆزو خۆڵی لاشە سووتاوەکەی کۆدەکەنەوەو دابەشی هەشت بەشی دەکەن هەر بەشێك دەنێرنە ناوچەیەکی دوور و ئێستاش هەر یەکێك لەو شوێنانە پەرستگایەکی بوزییەکانی لێیەو خەڵکی لەکاتی تایبەتی و پێویستدا ساڵانە وەك حەج سەردانی دەکەن[٢٠].

لای زەردەشتییەکان هەڵسوکەوتێکی تایبەتی لەگەڵ لاشەدا کراوە ئەو لاشەیەیان پاش مردن خستۆتە سەر دارە مەیت و کۆمەڵێك کەس بردوویانەتە شوێنێکی بەرزو لەبەر دەم باڵندەو دڕندە دانراوە تاکو هەموو گۆشتی لاشەکەیان خواردووە پاشان ئێسك و پروسکەکەی کۆکراوەتەوەو لە تاقێك یان لە گۆزەیەك هەڵگیراوە. ئەمە لە دواییدا بووە یاسایەك لە یاساکانی زەردەشت و لەلای ساسانییەکانیش بە هەمان شێوە ڕەفتار کراوە لەگەڵ لاشەدا. زەردەشت ئەو هەڵسوکەوتە لەگەڵ لاشەدا بە باش دەزانێی و بەخاك سپاردنی مردووش لەلای

(١٩) گەڕان بەدوای نەمرییدا، ل١٠٢.

(٢٠) دەروازەکانی ئایین لە نێوان زەوی و ئاسماندا، ئا: مەریوان ئەبوبەکر هەڵەبجەیی، ب١، ؟، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١٠٢.

جائیز نییە، هەروەها سووتاندنیشی چونکە لەلای ئەو (بەدەن نێوەندی پیسییەو بە خاك سپاردنی جائیز نییەو نابێ بسووتێنرێ چونکە ئاگر ئالودە دەکات).

مامۆستا (عبدالرقیب) لە باسێکی گۆڕی زەردەشتییەکاندا دەڵێ: "گۆڕەکانی زەردەشتی سەردەمی ساسانییەکان شێوازێکی تایبەتی هەبووە. قەبر هەبووە بریتی بووە لە ستونێکی بەردی تاشراو لولەیی یان گۆشەدار لەسەر سەرەکەی چەڵەکەیەك هەڵکەنراوە بۆ جێگیرکردنی بنی کوپە لە قەبر ئەمەش پاش ئەوەی لاشەی مردووەکە خراوەتە بەردەمی باڵندە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، پاشان ئێسکەکانیان کۆکردونەتەوەو خراونەتە ناو کوپە- گۆزەو سەرەکەی گیراوەو خراوەتە سەر ئەستونە بەردەکە"[21].

هەر لەبارەی زەردەشتییەکانەوە، هەندێکیان ئێسك و پروسکی مردووەکانیان بردۆتە ناو (دۆخمە) لە بەری کوپە قەبر، دۆخمەش بریتی بووە لە ژوورێکی وەك سەرداو لەژێر زەویدا کە لە پاڵ گردێکدا دروستیان کردووەو بە قوڵاییەکی زۆر نزیکەی ٣٠٠ پێ و بە شێوەیەکی چوار گۆشەیی. هەروەها ئەم ژوورەیان کردووە بەسێ بەشەوە بەشی یەکەم لە پێشوە بۆ پیاوەکان و بەشی دووەم بۆ ژنان و بەشی سێیەم بۆ منالەکانیان تەرخان کردووەو ئەم ئێسك و پروسکەیان بە شێوازێکی تایبەتی لەسەر خۆڵەمێش هەڵگرتووە... هتد. ئەم دۆخمەیە کۆمەڵێك وردەکاری تیادا بەکارهێنراوە. هەروەها بۆ ناشتنی مردووەکانیان لە دۆخمەدا هیچ جیاوازییەك لە نێوان ناشتنی بەڵنگازو هەژارو پارەداران نەبووە، توانەگەر و دەروێش هەروەکو یەکتری نێژراون[22].

شایەنی باسە ئاساری زەردەشتییەکان لە زۆر شوێن لە ئێران و کوردستانیش دۆزراوەتەوە، هەر لەهەمان شوێنی قەڵاچۆلان کە لەوەپێش باسمان کرد کوپە قەبر دۆزراوەتەوە کە تەنها ئێسك و پروسکی لە خۆ گرتووە جگە لەو کوپانەی کە خۆڵەمێشی تیادا بووە.

زەردەشتییەکان بەجێ بهێڵین و بێنە لای ڕۆمانییەکان، (ڕۆمانییەکانیش هەر زوو بەزوو لاشەی مردووەکانیان دەسووتاند بۆ ئەوەی زوو لەناوی بەرن)[23]. ڕۆژگارێکی زۆریش مردووەکانی خۆیان هاویشتۆتە ناو ئاوی ڕووبارو دەریاکان.

(٢١) صلاح الدین ئەیوبی خەڵکی دوینی ئەرمنستانە نەك دوینی هەولێر، عبدالرقیب یوسف، گ؛ هەزار مێرد، ژ١١، سلێمانی،؟

(٢٢) ئاوێستا، جەلال ئەمین بەگ؛ چ١، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٩١.

(٢٣) گەران بەدوای نەمرییدا، ل١٠٣.



هەروەها لای (بۆرۆرۆ- Bororo)* کان ( مردووەکە لە گۆڕێکی کاتی دەشارنەوە تا گۆشتەکەی دەرزێ و ئێسکەکانی ڕەنگ دەکەن و بە پەڕ دەیرازێننەوەو لەبەردەمی ماڵەکانیان هەڵیدەواسن و هەموو ئەم ڕێ و ڕەسمە بە ئاوازەوە دەکرێ)[24].

ئەوەی باسکرا کۆمەڵێك چارەنووسی جیا جیابوو بۆ لاشەی مرۆڤ لە پاش مردن، ئەگەرچی لە جیهاندا کۆمەڵێك شتی دیکەی سەیر هەیە کە لەبارەی چارەنووسی لاشەی مرۆڤەوە بیستراوە، لەوانە گوایە کەسانێك کەسەر بەکۆمەڵگا هەژارەکانن بەتایبەتی (ئەفریقییەکان) لاشەی مردووەکانیان دەفرۆشن بەو کارگانەی کە ئەلەف و ئالیك بۆ ئاژەڵان دروست دەکەن، دیارە ئەمەش لەبەر هەژاری و نەبوونییە. جگە لەوە لەهەندێك لە دوورگە دوورەکانی ئەم جیهانەدا لای ئەو کۆمەڵگایانەی کە هەرگیز شارستانییەت پێیان نەگەییوە کەسانێك هەبوونە لاشەی مردووەکانی خۆیان خواردووەو ئەگەر بەشەری زیندووشیان دەست بکەوتایە کە لە هۆزەکەی خۆیان نەبوایە ئەویشیان دەخوارد ئەم جۆرە مرۆڤانەش پێیان دەوترێ (مرۆڤ خۆرەکان) و ئەگەر بە جیهاندا بگەڕێین کۆمەڵێك شتی سەیرترو سەرسوڕهێنەر دەبینین و دەبیستین.

بە گشتی چارەنووسی لەش لەلای هەر هۆزو کۆمەڵ و میللەتێك بەپێی داب و نەریت و ویردو ڕێ و ڕەسمی تایبەتی ئەو میللەتە بەڕێوە دەچێت. بەڵام ئەوەی جێی بایەخە ئایینی ئیسلام و زۆر لە ئاین و بیرو باوەڕەکانی تریش ڕێزیان لە لاشەی مردوو گرتووە جا لەبەر هەر چ هۆیەك بێت. خۆ بە تەماکردن بێ بۆ ژیانەوەیەکی تر یاخود ڕێز گرتن بێ لە خودی مرۆڤەکە خۆی، بەهەر حاڵ چارەنووسی لاشەی مرۆڤ کۆتایی جۆراو جۆری بە خۆوە بینیوە لە چاڵ نان تاکو سووتاندن و با ئاودان... هتد.

پیرەمێردی شاعیر لە بەیتێکی شیعریدا کە باوەڕێکی لەخۆ گرتووە هەمان ئەو باوەڕەیە کە لەلای فەیلەسوفە یۆنانیە کۆنەکاندا هەبووە دەڵێ:

سروشتی ئادام لە چوار عونسرە- ضدی یەك: باو خاك، ئاو ئاگرە[25].

* بۆرۆرۆکان چینێکن لەو گەلانەی کە لەدەوری حەوزی ئامازون دەژین.

(٢٤) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

(٢٥) لە پەندەکانی پیرەمێرد، ل١١٦.

جا ئێمە لێرەدا دەڵێین بۆ ئەو چارەنووسانەی کەلاشەی مرۆڤ بەخۆیەوە بینی سەرچاوە بنچینەییەکەی لەم باوەڕەوە سەری هەڵندەدابێت؟! و شێوازی جۆراو جۆری مامەڵەکردن لەگەڵ لاشەدا هەوڵدانێك نەبێت بۆ گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ ئەو توخمە بنەڕەتیانەی کە بەپێی ئەو بۆچوونە مرۆڤ لێوەی دروست بووە یان پێکهاتووە؟!

## چارەنووسی گیان:

ئاشکرایە کە مرۆڤ لەدوو بەش پێکدێت لەش+ گیان، دیارە لەش بەشە مادییەکەی مرۆڤەو بینراوە بۆیە کێشەمان لەگەڵی دانەبوو، بەڵام گیان جێی پرسیارو بۆچوونە. مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە باوەڕی بە هەبوونی گیان هێناوە. سەرەتا بەهێزی بزوێنەری ژیان ناوی هێناوە پاشان هەوڵی داوە شوێنی گیان بدۆزێتەوە لەناو جەستەی مرۆڤ و شێوەی بۆ دروست بکات و لە ماهییەتی گیان بکۆڵێتەوە. دیارە زۆر باس و لێکۆڵینەوە کراوە گوایە روح کێشی هەیە، یاخود شوێنیان بۆ گیان دەستنیشان کردووە لەناو لەشی مرۆڤدا. یەك دەڵێ لەدڵ دایە و ئەوی تر مێشك دەکات بە شوێنی گیان.... هتد.، هەروەها وەکو ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیش چەند جۆرێکیان بۆ گیان دەستنیشان کردووە گوایە کاتێ مرۆڤ دەخەوێ یان نەخۆش دەکەوێ یەکێك لەم گیانانە لێی جیا دەبێتەوە... هتد.، بەڵام زانینی ئەمانە کاری ئێمە نییە، کاری ئێمە زانینی ئەو بەسەرهاتەیە کە بەچارەنووسی گیانەوە بەستراوە پاش مردن بێگومان ئەوەش کارێکی ئاسان نییە.

ئەگەر بمانەوێ لەسەرەتادا پێناسەیەك بۆ گیان بکەین ئەوە دەبێت بچینە ناو گێژاوێك کە زۆری دەوێ، جا لێرەدا بە کورتی باسی دەکەین و لەڕێی بۆچوون و ئاین و باوەڕەکانیشدا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە. هەندێ لە زانایانی کۆن و نوێش گیان بە (تەمێکی ناسك و جوان)[٢٦]. پێناسە دەکەن، هەروەها (روح= گیان بە توخم و ماکێکی نادیار و نەبینراو دانراوە کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خودا کە فووی لە مرۆڤ کردو روحەکەی پیاکرد)[٢٧]. هەروەك چۆن لە ئایەتی (فاذا سویتە ونفخت فیە من روحي فقعوا لە سجدین) (الحجر/٢٩)دا هاتووە.

(٢٦) گەڕان بەدوای نەمرییدا، ل٩٤.

(٢٧) مەرگ و دۆزەخ لە هزرو شارستانیەتی میسۆپۆتامیا، محمد سلێمان، گ؛ شانەدەر، ژ١٤، هەولێر ٢٠٠١.



خۆ ئەگەر هەوڵبدەین لەڕێی وشەکەوە پێناسەی گیانمان دەس بکەوێ ئەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە زۆربەی میللەتان و وشەکە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو وشانەی کە واتای با- هەوا دەدەن یاخود هەناسەدان. عەرەبەکان بە گیان دەڵێن (روح) گوایە پەیوەندی بە وشەی (الریح)وە هەیە- با، یانیش وشەی (نفس) بەکاردەهێنن ئەمەش کاتێ کە روحەکە لەناو جەستەدا بێ واتە بەیەکەوە بن دیارە ئەم وشەی (نفس)ە پەیوەندی بە (تنفس)وە هەیە.. هتد.

هەروەها سۆمەرییەکان بەگیان و تارمای مردوویان دەوت (GIDIM) واتە، ئافریدەی تاریك و پێیان وابوو لەگەڵ دوا هەناسەی مردووەکە گیان دەردەچێ و نەمانی جووڵە لە سینگی مردوو بە نیشانەی ژیان لەدەست دانیان داناوە، هەر لەبەر ئەمەش بوو بە ژیانیان دەوت (ZE)= با. جگە لەوەش بەگیان دەڵێن (نفش) واتە (التنفس)، میسرییە کۆنەکانیش بە روحیان گوتووە (BA)- باو لەلاتینی دا وشەی (ANIMA)ی بۆ بەکارهاتووەو لە یۆنانی (Pneuma) بەکاردێت کە واتای با- هەوا دەدات. واتە؛ هەموو لەگەڵ ئەو ڕایەن کە گیان هێزێکی نەبینراوەو ژیان بەخشە لەبەر ئەمە سیفاتی بایان پێداوەو بەهەوا یان- با ناویان هێناوە[٢٨].

لەلای ئایینی ئیسلام کە باسی گیان دەکرێ ڕاستەوخۆ پێت دەوترێ (ویسئلونك عن الروح قل الروح من امر ربي وما اتیتم من العلم الا قلیلا) (الاسرا و / ٨٥) هەروەها لە قورئاندا هاتووە.

(ولقد خلقنا الانسن من صلصل من حما مسنون فاذا سویتە ونفخت فیە من روحي فقعوا لە سجدین) (سورة الحجر/ ٢٨/٢٩)، واتە؛ لە ئایینی ئیسلام روح بە فەرمانێکی خوایی دادەنرێ کە مرۆڤ تێی ناگات یاخود زانیاری لەبارەیەوە نییە. هەروەها بە بەشێك لە روحی خودا دادەنرێ چونکە خوا خۆی فەرموودەیەتی (ونفخت فیە من روحي) گیانیش لای ئایینی ئیسلام پاش مردن بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان و لەوێ دەمێنێتەوە تا ڕۆژی مەحشەر. لەو ڕۆژەشدا حیساب لەگەڵ ئەو روحە دەکرێ، ئەگەرچی لەناو خەڵك باوەڕێك هەیە گوایە پاش ئەوەی مردوو لە گۆڕستان دەنێژرێ و خەڵکەکە دەگەڕێنەوە لەو کاتەدا لێپرسینەوە لەگەڵ مردووەکەدا دەست پێ دەکات: ناوی چییە؟ لەسەر چ ئاینێکە... هتد. مەحوی شاعیر لە شیعرێکیدا دەڵێ:

(٢٨ ) مەرگ و دۆزەخ لە هزرو شارستانیەتی میسۆپۆتامیا، هەمان سەرچاوە، ل٢٧-٢٨.

**مردوو كه گەییە قەبرو مەقەڕی، سوئالی لیّ**
**دەكریّ لە ڕەبب و، بەڵكی لە پێغەمبەرو لەدین**
**هەركەس جوابی دا بەجوابێكی باصەواب،**
**خێراتنی دەكەن لە طەرەف (خیر منزلین)**
گەر وانەبوو جوابی- خودایا بە تۆ پەناه:
**زنجیرو تەوق و ڕەوق و عذابی بووە قەرین**
**تا (یوم یبعث) كه بەپاكردنە لە قەبر**
**بۆ بردنە حوضوری شەهەنشاهی ڕۆژی دین**[٢٩].

واتە، هەندێك باوەڕیان بە سزادانی ناو گۆڕ هەیە. جا ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەو لێپرسینەوەو سزادانە لەگەڵ چی دەكرێ؟ ئایە لەگەڵ لاشەكەیە؟ چونكە ئێمە دەڵێین روحەكە دەردەچێ، یاخود روحەكە جارێكی تر دەگەڕێتەوە بۆ ناو جەستەكە تاكو لیّ پرسینەوەی ناو گۆڕی لەگەڵدا ئەنجام بدریّ ئەوانەی لایەنگیری ئەم بۆچوونە دەكەن ئایەتی (ربنا امتنا اثنتین واحییتنا اثنتین) (الغافر/ ١١) دێننەوە وەكو بەڵگەیەك بۆ پشتگیری كردن لە بۆچوونەكەیان جا ئەگەر گیانەكە گیانێكی خراپ بێت ئەوە سزا دەدریّ پاشان لەگەڵ گیانە خراپەكانی تر دەمێنێتەوە تا ڕۆژی حیساب و ئەگەر گیانێكی پاك بێت و ئیماندار بێت ئەوە پاش لێپرسینەوەی ناو گۆڕ ئەو گیانە پاكە لەگەڵ گیانە پاكەكانی تر لەجەنت دەمێنێتەوە تا ڕۆژی حەشر. بەم شێوەیە گیانەكە لە یەكەم ساتی مردندا لە جەستە جیا دەبێتەوە، بەڵام پاشان جارێكی تر دەنێردرێتەوە ناو جەستەكە بەمەستی لێپرسینەوەی ناو گۆڕ، لێرەدا جێی پرسیارە ئەو مرۆڤانەی لەگەڵ مردنیاندا لاشەكەیان پارچە پارچە دەبێت یاخود دەسووتێت ئەی ئەوانە چی؟ و چۆن لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكرێت؟

دیارە زانایانی ئایینی ئیسلام زۆر لە مەسەلەی روح قوڵ بوونەتەوەو زۆر ئایەت و فەرموودەیان لەم بارەوە هێناوەتەوە وەكو بەڵگە بۆ بۆچوونەكانیان، بەڵام كەس ناتوانیّ بڕیارێكی ڕەها لەم مەسەلەیەدا بدات چونكە هیچ دەقێكی ئایینی نییە لە قورئان كە ڕاستەوخۆ بە وردی باسی ئەو مەسەلەیە بكات، بۆیە مەسەلەی ماهییەتی گیان و لێپرسینەوەی گیان و چارەنووسی لەلایی زانایانی ئیسلامەوە شوێنی گفتوگۆبووە و

(٢٩) دیوانی مەحوی، ل٣٩١.



لێكدانەوەو شیكردنەوەی زۆری بۆ كراوە بە پشت بەستن بەو فەرموودەو ئایەتانەی كە باسی روحیان كردووە. و هەر كەسێكیش بیەویّ بە قوڵی بچێتە ناو بابەتەكە ئەتوانیّ بگەڕێتەوە بۆ ئەو كتێبە ئایینیانەی باسی مەسەلەی گیان دەكەن.

چارەنووسی گیان لەلای بیروباوەڕەكانی تریش چەند بەسەرهاتێك دەگرێتە خۆی بۆ نموونە: صابئەكان پێیان وایە گیان پاش مردن یا دەچێتە بەهەشتەوەو لەویّ هەمیشەیی دەبیّ، یاخود دەچێتە (المطهر) كە شوێنێكە بە پلەی جیا جیا مردووەكەی تیادا سزا دەدریّ بەپێی خراپەكانی هەتاكو پاك دەبێتەوە پاشان دەچێتەوە بەهەشت[٣٠].

دانیشتوانی میسۆپۆتامیاش باوەڕیان بەوە بوو كە دوای مردن گیان لە لاشە جیا دەبێتەوەو ئەو گیانە بەزیندوویی دەمێنێتەوەو كاتێك لاشەی مردوو لەنێو گۆڕ دەنێن، گیانەكەی دەچێتە جیهانی مردووەكان یان جیهانی ژێرەوەو چاكەو خراپەی خاوەندەكەی هەڵگرتووە لەگەڵ خۆیدا، جیهانی ژێرەوە لای سۆمەرییەكان و بابلییەكان شوێنێكی تاریكە دەكەوێتە ژێر زەوی و شوێنی ئەبەدی گیانە، هەر لە عێراقیشدا وا باو بووە كە گیانی مردووەكە وەكو بوونەوەرێك كە دوو باڵی پەرداری هەبێت دەردەچێت ئەمەش نزیكە لە بۆچوونی یۆنانییەكان لەمەڕ دەرچوونی گیانی مردوو جا خواوەند (هرمز) بەرەو جیهانی مردووەكانیان دەبات.

لای زەردەشتییەكانیش روحی مرۆڤ پاش مردن دادگایی دەكریّ ئەو دادگاییە لەسەر پردی (جینوەت) دەبیّ، ئەوەی روحی چاكە بەباوەڕی ئەوان كیژێكی جوان دێتە پێشوازی و دەیبەڕێنێتەوە بۆ بەهەشت بۆ لای ئەهرومەزدا و ئەگەر روحەكە خراپ بیّ پیرێژنێك دەچێتە پێشوازی و پاشان لەسەر پردەكە فڕیدەداتە خوارەوە بۆ دۆزەخ تا لەگەڵ ئەهریمەن ئازار بدریّ.

یۆنانییەكانیش باوەڕیان بەجیهانی ژێرەوە هەبووە كە روحی خراپی تێدایەو ناویان نابوو (ترتاروس).

لای میسرییەكانیش لە جیهانی ژێرەوە خواوەندی مردووەكان (ئۆزیرس) دادگای گیانی مردووەكان دەكات[٣١].

(٣٠) موسوعة العقائد والادیان، ص١٠.

(٣١) مەرگ و دۆزەخ لە هزرو شارستانیەتی میسۆپۆتامیا، ل٢٨-٢٩.

ئایینە ئاسمانییەکان باوەڕیان بەسزادان و بوونی بەهەشت و دۆزەخ هەیە لەگەڵ نەمری گیاندا، جگە لەمانیش کۆمەڵێك بیروڕای تر لە سەرچارەنووسی گیان هەیە، بۆ نموونە:

دوا هەمین فەیلەسووفی سروشتی کە (دیموکریت)ە، دەڵێ:

"روح لە چەند ئەتۆمێکی تایبەتی خڕو لووس پێکهاتووە پێی دەگوتن (ئەتۆمی روحی) کاتێك مرۆڤ دەمرێت ئەتۆمە روحییەکانی بەهەموو لایەکدا دەفڕن، بەم جۆرەش پێ دەچی جارێکی دی ئەم ئەتۆمانە لە پێکهاتنی روحێکی نوێدا بەشدار ببنەوە، واتە روحی مرۆڤ نەمر نییەو خەڵکانێکی زۆریش ئەمڕۆ بڕوایان وەك (دیموکریت)ە، دەڵێن روح پەیوەستی مێشکەو کاتێکیش مێشك هەڵدەوەشێتەوە مەحاڵە هیچ جۆرە ئاگاییەك بوونی بمێنێتەوە[٣٢]. هەر لە باس کردنی چارەنووسی گیاندا ڕووبەڕووی زەقترین بیروڕا دەبینەوە لەم بارەیەوە کە ئەویش دۆنادۆن- دۆنایدۆن- کراس گۆڕین"ە.

دۆنایدۆن یان کراس گۆڕین بریتییە لە دەرچوونی گیان لەلاشەیەك و دەرکەوتنەوەی هەمان گیان لە جەستەیەکی تر، جا چ ئەو جەستەیە مرۆڤ بێ یا ڕووەك یا ئاژەڵ، لە هەندێ ئەفسانەش داهاتووە گوایە گیانەکە دەچێتە ناو تەنێکی بێ جوڵە وەك بەرد لەوێدا گیانەکە زیندانی دەبێ.

ئەگەرچی ئایینی ئیسلام هەر لە بنەڕەتدا باوەڕی بەکراس گۆڕین نەبووە، بەڵام هەندێك لەبیرمەندەکان باسی چوار کراس گۆڕینیان کردووە، دیارە ئەمەش لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی ریشەی بیرو باوەڕە جیا جیاکانە بەیەکەوە لەلای ئەو کەسانە، چونکە لە زۆربەی ئایینە ئاسمانییەکان باسی گیان کراوە، ئەمە جگە لە باسکردنی لەلایەن فەیلەسووفەکانەوە جا تێکەڵ بوونی ئەم بۆچوونانە کە خۆیان لە بنەڕەتەوە نزیکن لە یەکتری شتێکی ئاساییە.

ئەم چوار کراس گۆڕینەش کە باسیان کردووە بریتی بوو لە:

١/نسخ: واتە گیانی مرۆڤێکی مردوو لە لەشی مرۆڤێکی تر بە دەردەکەوێتەوە.

٢/مسخ: واتە گیانی مرۆڤێکی مردوو لە لەشی ئاژەڵێك دا بە دەردەکەوێتەوە.

٣/فسخ: واتە گیانی مرۆڤێکی مردوو لە شێوەی ڕووەکێکدا بە دەردەکەوێتەوە.

---

(٣٢) جیهانی سۆفیا، یۆستاین گاردەر، و. بەهرۆز حەسەن، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٥٨.



٤/رسخ: واتە گیانی مرۆڤێکی مردوو لە شێوەی بێ گیانێکدا بە دەردەکەوێتەوە[٣٣].

ئەم بیری دۆناودۆنە لەلای زۆر میللەت و باوەڕو ئایین زادا هەیە، و زۆرجاریش بۆتە سەرچاوەیەکی باش بۆ دروستبوونی ئەفسانە و حیکایەتی میللی ئەو کۆمەڵەو هەر میللەتە بەپێی تێڕوانین و بۆچوونێکی تایبەتی لێکی داوەتەوە.

میسرییە کۆنەکان هەولێن کەس بوونە باوەڕیان بە نەمری گیان هەبووە، لەو باوەڕەدا بوون مرۆڤ پاش ئەوەی دەمرێت گیانی لە لەشێکی تر و بەزنجیرە لە هەموو گیانلەبەرەکاندا دەسورێتەوە، ئەوانەی لەسەر زەوی و لەناو دەریادا هەن. ئەو ساجارێکی تر دەگەڕێتەوە نێو لەشێکی ئادەمیزاد و ئەم هەموو کراس گۆڕینە سێ هەزار ساڵ دەخایەنێ، دیارە هەر لەبەر ئەوەیە بیریان کردۆتەوە لاشەی مردووەکانیان مومیا بکەن بۆ ئەوەی لەو گەشتەدا جارێکی تر گیانەکە بچێتەوە هەمان لاشەکەی خۆی، هەروەها ئەم بیری دۆنایدۆنە لای فیتاگۆرسییەکانیش بەهەمان شێوە هەبووە، فیتاگۆرس خۆی وتویەتی گوایە پێنج جار کراسی گۆڕیوەو ژیانی خۆی لە شێوەی گیان لەبەردا دێتەوە بیر[٣٤].

لەناو میللەتی کوردیشدا کاکەییەکان باوەڕیان بە دۆنادۆنی گیان هەیە ئەوان پێیان وایە کە لەم دنیا بترازێ دنیایەکی تر بۆ هەمان جەستە نییە، بەڵکو و ڕوحەکە دەچێتەوە قاڵبێکی تر، جا ئەم دۆنادۆنی گیانە بەردەوام دەبێت تاکو بەتەواوەتی گیانەکە پاك دەبێتەوەو تێکەڵ دەبێتەوە لەگەڵ حەق واتە خودا.

یزدییەکانیش بڕوایان لەسەر ئەوەیە کە مرۆڤ ئەگەر چاك بێ کاتێ دەمرێ گیانەکەی دیسانەوە دەچێتە نێو لەشی منداڵێکی چاك، ئەگەر مرۆڤێکی خراپیش بووبێ، گیانەکەی دەچێتە لەشی جانەوەرێکی دڕندە ولایان وایە بەم جۆرە سزای ئەم گیانە دەدرێ لەسەر خراپەکانی کە لە ژیانی یەکەمی کردوویەتی[٣٥].

هەروەها لە بارەی ئەو دۆناودۆنە، لەلای ئەو کەسانەی باوەڕیان پێیەتی دەڵێن گوایە گیانی خراپ دەچێتە ناو لاشەی ئاژەڵێکی دڕندە و ئەگەر گیانەکە تۆ بە بکات، لەوێوە کراس گۆڕینی پێ دەکرێ و دەچێتە ناو باڵندەیەك یا ڕووەکێك... هتد. تاکو بەتەواوەتی

---

(٣٣) گەڕان بەدوای نەمرییدا، ل٩٨.

(٣٤) سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧-٩٨.

(٣٥) ئیزیدییەکان، سدیق بۆرەکەی، گ؛ رامان، ژ٥٢، هەولێر، ٢٠٠٠.

گیانەکە پاك دەبێتەوە لە خراپەکاری و پاش پاکبوونەوەی تەواو و چەندین کراس گۆڕین گیانەکە ڕزگاری دەبێت و تێکەڵ دەبێتەوە لەگەڵ خوا.

بیرۆکەی دۆنایدۆن لای ئایینی ئیسلامیش کۆمەڵێك نیشانەی پرسیارو سەرسوڕمانی لەسەرە، چونکە ئایینی ئیسلام بەهیچ شێوەیەك باوەڕی بە دۆنایدۆن نییە، و لەناو عەقیدی ئیسلامیدا نییە (ویسئلونك عن الروح قل الروح من امر ربي) (الاسرا و/٨٥)، کەچی هەندێ موسڵمان باسیان لێوە کردووە بۆ نمونە: (شێخ شەمسەددین تەبریزی لە قەسیدەیەکی دا نووسیەتی) (گر بگویم شرح جان خویش نهد هفتا دقالب دیدهام) واتە؛ ئەگەر باسی جان = گیانی خۆم بکەم و سەربردەی بگێڕمەوە نۆسەدو هەفتا قالب= بۆتە- شێوەم دیوە)[٣٦].

لای سۆفیەکانیش ئەم باوەڕە دەست دەکەوێ (موریدەکانی تەریقەتی نەقشبەندی دەڵێن: (شێخ عوسمانی دووروی نەقشبەندی) لە هەورامان هەمان شێخ (سراجەدین)ە واتە: شێخ عوسمانی گەورەیەو جارێکی تر بەلەش و شێوەو روح و توانای کە رامایتییەوە لەدایکبۆتەوە)[٣٧].

هەروەها گوایە چەند ئایەتێك هەیە پێدەچێت مەبەستی دۆنادۆن بێت لەوانە:

((**نحن قد رنا بينكم الموت وما نحن بمسبوقين* على ان نبدل امثلكم وننشئكم في مالا تعلمون* ولقد علمتم النشاة الاولى فلولا تذكرون* افر و يتم ما تحرثون* انتم تزرعونه ام نحن الزارعون**)) (الواقعە/ ٦٠- ٦٤).

لە (اوضح التفاسیر) ی (ابن الخطیب) بەم جۆرە لێکدراوەتەوە (وا لەم ئایەتە تێدەگەین کە مرۆڤ دوای مردنی لەبەرامبەر کارە خراپەکانی بە شێوەیەکی کەمتر لەجارانی دروستبێتەوە، هەروەها لەبەرامبەر کارە چاکەکانید وەك پاداشتێك لە شێوەیەکی باشترو باڵاتردا دروست بکرێتەوە، ئەم قسەیەش زۆرکەس دژی دەوەستێت چونکە ئەمە دۆنایدۆنە و دۆنایدۆنیش لە ئیسلامدا نییە)[٣٨].

بەڵام ئێمە لە چەندین تەفسیر و شەرحی تردا بەدوای شەرحی ئەو ئایەتە چووین و لەهیچ کامیان بەم شێوەیە تەفسیر نەکرابوو.

بەڵکو تەفسیری تری بۆ کراوە دوور لە بیرۆکەی دۆناودۆنەوە.

(٣٦ ) گەڕان بەدوای نەمرییدا، ل٩٩.

(٣٧ ) دەروازەکانی ئاین لە نێوان زەوی و ئاسماندا، ل٥٦.

(٣٨ ) سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥-٥٦.



هەر لەمەڕ کراس گۆڕین ئیسلام جێ دێڵێن و دەچینە لای هیندۆسییەکان کە باوەڕێکی تەواویان بە کراس گۆڕین هەیە، ئەوان پێیان وایە کاتێ روح لە جەستەی مردوو دەچێتە دەرەوە هێشتا کۆمەڵێ ئارەزوو حەزی هەیە کە جێ بەجێی نەکردوون، جگە لەوەش کۆمەڵێك کاری باش و خراپی هەیە کە دەبێ پاداشتی وەرگرێ یان بیداتەوە. جا بۆیە دەبێ لە لاشەیەکی تردا ئەم ئارەزوو حەزانەی بێنێتەجێ و سزاو پاداشتی بدرێتەوە لە سەرکارەکانی بۆ ئەوەی روحەکەی پاك بێتەوە. و ئەگەر روحەکە هەموو ئارەزووەکانی جێبەجێ کردوو قەرزەکانی دایەوەو ئۆباڵی کەسی بەسەرەوە نەماو نەگوناهێکی هەبوو پاداشتی بداتەوەو نەخراپەیەکیش سزای بدرێ لەسەری، ئەوە لەو حاڵەتەدا گیانەکەی ڕزگاری دەبێت لە دۆنادۆن و گیانەکە بۆ لای براهما- خوا دەگەڕێتەوەو ئاوێتە دەبێتەوە. خەسڵەتی سەرەکی لەم مەسەلەیە ئەوەیە لەم گەشتە روحییە روحەکە هیچ شتێك دەربارەی ژیانی ڕابردووی خۆی نازانێت هەر گەشتێك بەتەواوەتی دابڕاوە لەوی تر و بە دەگمەن جار وا هەیە گیانەکە ئاگادارە لە ژیانەکەی پێشوو تری[٣٩]. تەواوی ئەم بیرو باوەڕەش لەبیرو ڕای کاکەییەکانەوە نزیکە. لای بوزییەکانیش باسی دۆنادۆن لە ئارادایە جارێ (بوزا) خۆی گوایە چەندین جار کراسی گۆڕیوە لە تەیرەوە بۆ پاشا بۆ... هتد.

و بەپێی باوەڕی بوزییەکان مرۆڤ پێکهاتەیەکە هێزێکی ناوەکی هەستپێنەکراو دەبیزوێنێت ئەم هێزە شاراوەیەو ژیان بەخشە. و پێی دەوترێت (دارما- روح) و هەر وەکو چۆن لای هیندۆسەکان باوە ئەمانیش باوەڕیان بەکراس گۆڕین هەیە، ئەگەر مرۆڤەکە باش بێت ئەوە گیانەکە دەچێتە نێو لەشی مرۆڤێکی چاکەوە یاخود هەر شتێکی تری باش و ئەگەر خراپ بێ دەچێتە ناو لاشەی زیندەوەرێکی خراپ یان بێ گیانێك، بۆ نمونە بچێتە ناو ڕووەکێکەوە کە بەدەست بێ ئاوییەوە ئازار بچێژێ، یاخود بوزا دەڵێ منداڵێك کە بەکەم ئەندامی یا بەناشرینی لەدایك دەبێ چ تاوانێکی هەیە کە بەدرێژایی تەمەنی بەدەست ئەم کەم و کوڕیەی خۆیەوە بناڵێنێ، ئەو دەڵێ ئەمە جۆرە سزایەکە بۆ گیانەکە چونکە گیانێکی خراپ کار بووە لەژیانی پێشوودا. واتە: بەهەشت و دۆزەخی مرۆڤ لەسەر زەوییە، و ئەگەر مرۆڤ توانی هەر چ حەزو ئارەزوویەکی هەیە بیکوژێ و خۆی لە هەموو پێداویستییەکانی

(٣٩ ) سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

ژیان بەدوور بگرێ و کاری باش و خراپی نەبێ ئەوە ئەو کاتە روحەکە نەجاتی دەبێ لە دۆنادۆن و دەچێتەوە نێو (نێرڤانا)[*] [٤٠].

ئەوانەی باسی دۆنادۆن دەکەن لەهندی و بوزی ... هتد. دەڵێن ئەو گیانەی کە دۆنادۆن دەکات کاتێ لەلاشەیەکەوە دەچێتە نێو لاشەیەکی تر بێ ئاگا دەبێت لە ڕابردووی خۆی. باشە لێرەدا هیچ واتایەك دەمێنێ بۆ وشەی سزاو پاداشت؟ خۆ ئەگەر ئاگات لەوە نەبێ کە ئەمەی بەسەرتا دێت پاداشتە یان سزایە بۆ کارەکانت چ واتایەکی دەبێت؟ چونکە لە هەموو ژیانێکی نوێدا گیانەکە لە سفرەوە دەست پێ دەکاتەوە، بۆی هەیە کاری باش بکات یان خراپ بەپێی ئەو بارودۆخەی کە تێیدا زیندوو بۆتەوە یاخود لە دایکبۆتەوە، و ئەگەر بێت و بەم شێوەیە بێت دەبێ گیان هەمیشە لە سوڕانەوەدا بێ و هەمیشە کراس بگۆڕێ.

دوا وێستگەی ئەم باسە باڵای (جینی)ەکان بێت کە ئاینزایەکە لە ناوچەکانی هیندو دەوروبەری بڵاوبۆتەوەو ڕیشەی هەیە. ئەمانیش پێیان وایە کە ئاسمان حەوت طەبەقەیە (ئاست) هەر طەبەقەیەکی جۆرێکە لە بەهەشت بە پلەی جیا جیا، ولەژێر زەویش دۆزەخ هەیە بەهەمان شێو حەوت ئاستی پلەداری هەیە.

ئەگەر مرۆڤەکە چاکەو خراپەی وەك یەك بن یاکەمێك جیاوازی هەبێ لە نێوانیان ئەوە روحەکە لەسەر زەوی دەمێنێتەوەو دۆنادۆن دەکات و دەچێتە ناو لاشەکەیەکی تر بەپێی چاکەو خراپەکەی، بەڵام ئەگەر مرۆڤ چاکەی زۆر بوو و خۆی لە خۆشییەکانی ژیان بەدوورخست بوو ئەوە لە یەکێك لە ئاستەکانی بەهەشت هەمیشەیی دەبێ، و ئەگەر خۆی لە هەموو شتێك بەدوور گرت و گۆشە گیربوو لە ژیان ئەوە بەرزترین پلەی بەهەشتی پێ دەدرێ و ئەگەر گیانەکە خراپەی زۆرتربێ لە باشەی ئەوە ئەو گیانە دەچێتە نێو لاشەی ئاژەڵێك یا

* نێرڤانا وەکو چۆن پێناسە کراوە لە ل١٣١ دەروازەکانی ئایین دا: نێرڤانا= شوێنێکە نە زەوی تێدایە نە ئاسمان، نەبای تێدایە نە ئاو نە تاریکە نەڕوون، نە نزیکە نەدوور، باسی ناکرێت وێنەشی ناگیرێت.. تەنها روح دەیناسێت چونکە لەوەوە هاتووە بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە، بە پاکی لێی هاتۆتە دەرەوەو هەر بە پاکیش دەچێتەوە ناوی.

(٤٠ ) سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٤.



ڕووەکێك تا پاك دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر خراپەی زۆر زۆر تر بوو ئەوە دۆزەخی ژێر زەوی باوەشی بۆ دەگرێتەوە[٤١].

بەپێی دۆنادۆن دەتوانین بڵێین گیان وزەیەکە لەگەڵ فۆرمدا ژیان دروست دەکا، بەڵام بەڕاستی کەس ناتوانێ بڕیار لەسەر مەسەلەی ماهییەتی روح= گیان و چارەنووسی لە پاش مردندا بدات، لەبەر ئەوە بۆچوونەکان لە چوار چێوەی گریمانەدا دەمێننەوە.

(٤١ ) سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٩.

**گۆڕستان:**

پاش مردن دوا هەوارگەی مردوو دیارە لە گۆڕدایە. ئەو گۆڕەش دەبێتە ماڵی هەتا هەتای مردووەکە، جا کاتێ کەسێکی تر دەمرێ حەز دەکا لەو ماڵە هەتاهەتاییەی دراوسێیەتی ماڵێکی تر بکات، بەم شێوەیە دراوسێیەکان زۆر دەبن تا گەڕەکێك دروست دەکەن، پاشان شار، بەڵام شاری مردووەکان شارێکە بێ دەنگ و هێمن بێ جوڵەیە ئەم شارە ناوی لێنراوە گۆڕستان.

گۆڕستان شارێکە دەشێ بڵێین سەرنشینەکانی هەمووی لە خەوێکی هەمیشەیی دان لەبەر ئەوە بێ دەنگن خەیام لەم بارەیەوە دەڵێت:

**گۆڕخانە نشینان کە لەبن سەرپۆشن**
**خۆڕایی نییە وەها کپ و خامۆشن**
**ئەی خوایە لەکام بادەیە دەرخواردت دان؟**
**بێ هۆش و بۆ هەتا هەتا سەرخۆشن[٤٢].**

دیارە لە بادەی مردن دەرخواردی داون، ئەو مردنەی کە دەبێ هەموو کەس بیچێژێ، و هەروەکو وتمان مرۆڤ ڕووبەڕووی ئەم دیاردەیە بۆتەوەو جۆرەها هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردووە، یەکێك لەو کردەوانە مردوو ناشتن بووە، ئەم مردن ناشتنەش جێگاو ڕێگای خۆی هەیە، لێرەدا باسی شوێن دەکەین ئەو شوێنانەی کە مرۆڤیان لێ دەنێژرێ، پرسیارەکەمان ئەوەیە کاتێ مرۆڤ پەیڕەوی مردوو ناشتنی کردووە، ئایە جێگایەکی تایبەتی و دیاری کراویان داناوە بۆ ئەم مەبەستە؟ یاخود بێ گوێدانە جێگاکە دەنێژران؟.

دیارە هەموو دیاردەیەك گۆڕانکاری بەسەردا دێت لەو دیاردانەش ناشتنی مردووە، کە بەپێی سەردەم و بیرکردنەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

مرۆڤ لە سەرەتادا شاری نەبووە و زیاتر ژیانێکی ڕەوەندیی ژیاوە، برۆنۆفسکی دەڵێ: (شاری مردووەکان بەر لە شاری زیندوان دامەزراوە چونکە نیشانەکانی جێگیری لەگەڵ ئەو ڕاوچیانە دەستی پێ کردووە کە هەوڵیان داوە مردووەکانیان هەمووی لە جێگایەکی دیاری کراو بنێژن و بە ئەنجام دانی ڕێو ڕەسمێکی تایبەتی و لە شارستانیەتە کۆنەکانیش لە دەوروبەری گۆڕەکان جێگای ئاهەنگی تایبەت دروست کراوە خەڵك بەزۆری لە دەوری کۆ دەبوونەوە وەکو

(٤٢ ) چوارینەکانی خەیام، ل٢٧.



پەرستگایەك یا شوێنێکی پیرۆز بۆ پێشکەشکردنی قوربانییەکانیان و بەهۆی ئەمەوە پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ جیهانی مردووەکان دروست بووە)[٤٣].

زۆر لە لێکۆڵینەوە ئاسارییەکان بۆمان ڕوونی کردۆتەوە کە شێوازی گۆڕو ناشتنی مردوو و گۆڕستان بەپێی سەردەمەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

لە چەندین شوێن گۆڕ دۆزراوەتەوە لەژێر خانوو و لەناو ماڵەکاندا نێژروان لەوانە لەناوچەی (چەرموو)ی نزیك چەمچەماڵ، جێگای گۆڕ لە هەمان ئەو ماڵەدا بووە کە مردووەکەی تێدا ژیابوو.

هەروەها لە سووریا کۆمەڵێك گۆڕ دۆزراونەتەوە لە (اوغاریت) کە لەژێر زەویی ماڵەکاندا نێژرابوون، ئەم ژێر زەوییە گۆڕستانی هەموو ئەندامانی ئەو ماڵە بووە، هەر ئەندامێکی ئەو ماڵە بمردایە لەوێ دەنێژرا[٤٤].

لە شوێنەوارەکانی (بەرکەل)یش چەن گۆڕێك دۆزراونەتەوە، ئەم گۆڕانە مەیلەو لاکێشەیین و لەبەر کۆنیان قووڵییەکەیان دیار نییەو بە بەرد هەڵچنراون وەك هۆدەیەکی بچووك، درێژێکەی لە ٢م زیاترەو پانییەکەی نزیکەی ١,٥م بووە، یەك دوو تاتە بەردی گەورە بەکارهێنراوە بۆ ئەوەی سەردەمی گۆڕەکەی پێ بگیرێ. هەر گۆڕێك چەند کەللە سەرێکی تیادا دۆزراوەتەوە ژمارەی هەندێکیان گەیشتۆتە (١٦) کەللەسەر، و هەروەکو چۆن خەڵك باسیان کردووە ئەم گۆڕانە هەر یەکیان هی بنەماڵەیەك بووە، چونکە بەشێکیان لە تەنیشت خانوو بوونە. وپێ دەچێ مردووەکان لەیەك ڕۆژدا نەمردبن و نەنێژرابن، بەڵکو هەر یەکێك مردبێ تاتە بەردی سەر گۆڕەکەیان لاداوەو مردووەکەیان خستۆتە ناوی[٤٥].

دیارە مردوو شاردنەوەش زۆر شێوەی بە خۆوە بینیوە هەندێ جار و لەهەندێ سەردەم خەڵکانێك هەبوونە مردووەکانی خۆیان لەنێو چینی دیوار شاردۆتەوە، ئەوەش لە سەردەمێك بووە کە خەڵکەکە لەبەردەمی ترس و هێرشدا بوونە، چونکە زۆرجار لەشەڕەکاندا خەڵکی ناوچەیەك دەشکان جا خەڵکە سەرکەوتووەکە بۆ سووکایەتی پێکردنی لایەنەکەی تری شەڕەکە مردووی ناو گۆڕەکانیان وەکو زیندوو ئازار دەدا (ئاشوور بانیبال) گۆڕی شای ئیلامییەکانی

(٤٣ ) الاسلام وملحمة الخلق والاسطورة، ص٣٩.

http://www.souriana.com/modules/news/aticle.php?storyid= 2596( ٤٤)

(٤٥ ) شوێنەوارەکانی پەکۆڵی و بەرکەل، عبدالرقیب یوسف، گ، هەزار مێرد، ژ٥، سلێمانی، ١٩٩٨.

هەڵکەندووەو ئێسکەکانی لەگەڵ خۆیدا برۆدتەوە ئاشوور. ئەو لای وایە کە ئیلامییەکان پاشاکانی پێش ئەویان نیگەران کردووە لەبەر ئەوە گۆڕەکانیانی هەڵکەندوو پەیکەرەکانیانی دایە بەر هەتاوو ئێسکەکانی بردن گوایە بەم شێوەیەش ئازاری گیانی مردووەکانی داوەو لە قوربانی و خواردن و ئاو بێ بەشی کردوون[٤٦].

زۆر لەکۆنەوە پەرستگاکانیش جێگای گۆڕستان بووە یاخود بە پێچەوانەوە گۆڕستانەکان پەرستگا بوونە، هەروەها زۆرجارو لەزۆر شوێنیش گۆڕو گۆڕستانەکان لەناو ماڵەکاندا بووە، بەڵام جگە لەوەش هەر لە کۆنەوە وێنەی گۆڕستانی تایبەتی هەبووە کە تەنها شوێنی مردوو ناشتن بووە بۆ نموونە:

لێکۆڵەرەوەکان گۆڕستانێکی مەزنیان لە (اریدو) دۆزیوەتەوە مێژووەکەی بۆ نیوەی یەکەمی هەزارەی چوارەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە و بەشێوازێکی پێشکەوتوو دادەنرێ لە ناشتنی مردوو چونکە ئەم گۆڕستانەکە (١٠٠٠) گۆڕ زیاتری تیادا بووەو تاڕادەیەك لەماڵ و شوێنی ژیانی خەڵکەکەوە دوور بووە[٤٧].

واتە: لەو سەردەمەوە شوێنی تایبەتی دانراوە بۆ ناشتنی مردووەکان کە پێی دەوترێ گۆڕستان، و گۆڕستان هەتا ئێستا شوێنی ناشتنی هەموو مردووەکانە، بەڵام شەرتیش نییە هەموو مردوویەك لە گۆڕستان بنێژرێ، چونکە زۆرجار و لەژێر کاریگەری هۆیەکی تایبەتی مردووەکە لەجێگایەك بەتەنیا دەنێژرێ، جاری واش دەبێ مردووەکە بەر لە مردنی وەسیەت دەکات و جێگای ناشتنی خۆی دەستنیشان دەکات وەلی دێوانە دەڵێ:

**تەنیا گۆڕەکەم لەرێی خێلان بێ**
**نزیك هەوارگەی جاف و گۆران بێ**
**کێلێکی بەرزی بەقەد باڵای شەم**
**لەژوور سەرم بێ بێ زیادو بێ کەم**[٤٨].

(٤٦ )گەران بەدوای نەمریبیدا، ل١٠٢.

(٤٧ ) اثاربلاد الرافدين من العصر القديم حتى احتلال الفارس، ستيون لويد، تـ: د. سامي سعيد الاحمد، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٠، ص٥٠.

(٤٨ ) دیوانی وەلی دێوانە، کۆکردنەوەی محمود خاکی، چ٢، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٣، ل١٥.



واتە دێوانە جێگاو شێوازی گۆڕی خۆی دەستنیشان کردووە، جگە لەویش (تەوفیق وەهبی) لەوەسیەتەکەیدا داوا دەکات لە چیای پیرەمەگرون بنێژرێ وەسیەتەکەشی دەهێنرێتە جێ و لەوێ دەنێژرێ. هەروەها زۆری تر بەر لە مردنیان شوێنی گۆڕەکەی خۆیان دەستنیشان کردووە، زۆرجاریش دەبینین تاکە گۆڕێك بەتەنها لە جێگایەك دایەو بەزۆری گۆڕی پیاو چاکەکان کە لە گۆڕستاندا نەنێژراون.

لەکتێبی (فقە السنة) داهاتووە، گوایە پێغەمبەر (د.خ) مردووەکانی لە گۆڕستانی (البقیع) ناشتووە، واتە شوێنێکی دەستنیشانکراو هەبووە بۆ گۆڕستان، بەڵام قسەو باسی واش هەیە گوایە پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ دوو برادەرەکەی لە ژوورەکەی حەزرەتی (عائشە) دا نێژراون، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر (د.خ) جەختی لەسەر ناشتنی شەهید لە شوێنی شەرەکەیدا کردووە ئەگەر بکرابایە[٤٩].

لە کوردستانیش چەندەها گۆڕی تاك تاکمان هەیە، کە هەریەکی دەکەوێتە لایەکەوەو بەهۆیەکەوە لەو جێگایە ناشتراوە.

لە هەولێر گۆڕی ستی ئیمام هەیە گۆڕی ئافرەتێکی چاکە، دەکەوێتە ناو ئێستگەی شەمەندەفەری هەولێر، گۆڕەکە لەژوورێکی بچووك دایە، خەڵکی هەولێر دەڵێن گوایە گومبەت قەبوڵ ناکات بۆیە بێ گوبەتە و لە گۆڕی بابە گوڕ گوڕەوەش زۆر دوور نییە[٥٠].

هەروەها لەو گۆڕانە، گۆڕی پێنجە عەلی، کە مەزار پیاو چاکێکەو دەکەوێتە بەرامبەر مزگەوتی شێخ مستەفای نەقشبەندی، شورەیەکی بۆ کراوەو چەند گۆڕێکی لێیە، بۆیە گۆڕستانی پێنجە عەلیشی پێ دەڵێن[٥١].

مەرقەدی (عوزێر) پێغەمبەریش هەر لە هەولێرە، کە دەکەوێتە نێوان مزگەوتی شێخی چۆلی و پردی مەحەتە، دەربارەی ئەم مەرقەدە زۆر ڕا هەیە، هەندێك دەڵێن گۆڕی خۆیەتی و هەندێ ڕای تر دەڵێن شوێنێکی تایبەتی ئەو بووە، بەڵام لەسەر پارچەیەك بەرد ئەم نووسینە

(٤٩ ) صحيح فقه السنة وادلته وتوضيح مذاهب الائمة، ابو مالك كمال بن السيد سالم، ج١، المكتبة التوفيقية، ؟، ص٦٠.

(٥٠ ) هەولێر، کۆمەڵە وتارێکی ڕۆشنبیری شارەوانی هەولێر ئامادەی کردووە، ئا. شێرزاد قادر و تەحسین چیچۆ، هەولێر، ١٩٨٥، ل١٠١.

(٥١ ) هەمان سەرچاوە، ل١٠٢.

عەرەبییەی لەسەر دۆزراوەتەوە ئەمەش کوردیەکەیەتی: (ئەمە گۆڕی حەزرەتی عزالدین پێغەمبەر، عبدالفتاح افندی کوڕی ابراهیم ئەفەندی کەرکووکی خودا لێ ڕازی بێت... [٥٢])
لێرەدا شایەنی باسە ئاماژە بەوە بکەین کە گۆڕێك لە گۆڕستانی (نەبی دانیال) لەسەر قەڵای کەرکووك هەیە بەناوی (نەبی عزیر). من بۆ خۆم چوومە سەر ئەو گۆڕە، بەڵام نازانین ئاخۆ کامەیان گۆڕی ئەو شخصەیە ئەوەی هەولێر یان ئەوەی کەرکووك؟ ئایە هەردوو کەسەکە یەکێکن یان هی دوو کەسی جیاوازن؟

جگە لەوەش گۆڕی بابە گوڕ گوڕ هەیە لە هەولێر کە تەنیا گۆڕێکە بەبەردی سپی داپۆشراوەو گۆڕێکی درێژە، گوایە کابرایەکی درێژ بووەو هەندێ ڕاش هەیە لە بارەی درێژییەکەیەوە دەڵێ ئافرەتان بە بەردەوام سەردانی دەکەن و بەردو خۆڵ لەمسەرو ئەوسەری گۆڕەکە دادەنێن بۆیە درێژ بۆتەوە. ئەو ئافرەتانە بۆ داواکردنی منداڵی کوڕ بەتایبەتی دەچنە سەری و دەڵێن (بابە گوڕ گوڕ بە گوڕ هاتم بۆ کوڕ هاتم) [٥٣]. هەر بۆ هەمان مەبەستیش ئافرەتان دەچنە خاکەکەی بابەگوڕ گوڕ لە کەرکووك و هەمان داواکاریان هەیەو هەمان ئەو قسەیەش دووبارە دەکەنەوە.

گۆڕی تەنها یان چەند گۆڕێکی کەم بەیەکەوە زۆرن هەر لە هەولێر شێخی چۆڵی و سوڵتان موزەفەر و شێخەڵڵا... هتد. لە کەرکووکیش ئۆمەرمەندان و وەکاشەو یل ئیمام... هتد. و لە شارەکانی تریش زۆرن و هەر یەکێك لەم گۆڕانە چیرۆکێکی پێوە لکاوە و کەس نازانێ چیرۆکەکە تەواوە یا نا.

جگە لە پیاو چاکیش گۆڕی تر هەن بۆ نموونە گۆڕی (قەرو گوڵەزەر) کە دوو دڵخواسی یەکتر بوونەو گۆڕی وەلی دێوانەو گۆڕی لاوکی غەریب و ...هتد. کە جێگای تایبەتیان هەیە.

لە ساڵی (١٩٩١)یش لە کوردستان کۆڕەوێکی یەکجار گەورە ڕوویدا لەو ڕێگایەدا چەندین کەس گیانی لە دەستدا جا ئەو مردووانە لە هەمان جێگادا نێژران، هەبوو بە ئەمانەت مردووەکەی ناشت و پاشان گەڕاندییەوە بۆ ناوچەکەی خۆی، بەڵام زۆریشی هەر لەو شوێنانە مایەوە جا دوور نییە پاش چەند ساڵێکی تر ئەم گۆڕانە بکرێن بە گۆڕی پیاو چاك و مەرقەدیشیان بۆ بکرێ خەڵکیش بچێ بۆ زیارەتی.

(٥٢ ) سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٤.

(٥٣ ) سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٠.



دیارە گۆڕی تاك لە کوردستاندا زۆرەو باسکردنی هەموویان و بەدوا داچوونیان زۆری دەوێ جگە لەوە گۆڕستانیشمان یەکجار زۆرە. و لەکاتی کارکردنمان بۆ ئەنجام دانی ئەم باسە چەند گۆڕستانێك گەڕایین، نووسینی سەر گۆڕەکانمان تۆمارکرد وێنەمان گرت و یەکێك لەو گۆڕستانانە، گۆڕستانی نەبی دانیال بوو لەسەر قەڵای کەرکووك ئەم گۆڕستانە بەڵگەیەك بوو بۆ بوونی گۆڕ لەناو شوێنە پیرۆزەکان. و شوێنە ئایینییەکان، چونکە خۆی مزگەوتێکەو لە ژووری مزگەوتەکە سێ گۆڕ هەبوو (نەبی دانیال و نەبی حنین و نەبی عزیز)و لە دەرەوەی مزگەوتەکەو لە حەوشەی دەوروبەرەکەی چەندین گۆڕی تری لێ بوو کە زۆریان کۆن بوون و زۆربەیان نووسینی بەسەرەوە نەمابوو، دیارە ئەم گۆڕستانە تایبەت بووە بە دانیشتوانی سەر قەڵا لەو سەردەمەدا، هەر لەبارەی ئەم مزگەوتەوە وتراوە: (مزگەوتێکی بچووکە لەسەر شێوەی کەلیسەیەکی کۆن دروست کراوەو لەناو مزگەوتەکەدا گۆڕی خوا پەرستی لێیە کە ناوەکانیان حەنانیاو عزراو میشائیل بووەو ئێستا بە مزگەوتی نەبی دانیال بەناوبانگە)[٥٤].

و لەڕاستیشدا ئەو مزگەوتە لەسەر شێوەی مزگەوتەکانی تر نەبوو بۆیە ئەشێ کلێسە بووبێ و پاشان لەگەڵ هاتنی ئیسلامدا کرابێ بە مزگەوت.

دیارە پاش ئەوەی کە شاری گەورە دروست بوو و ژمارەی خەڵکەکە کە زیادی کرد هاوکات لەگەڵ ئەودا گۆڕستانەکانیش زۆربوون. هەر شارێك لە شارەکانی کوردستان بگرە چەندین گۆڕستانی تێدایە، ئێمە هەوڵماندا لە هەر شارێك یەك گۆڕستانی کۆن وەربگرین جا بۆ ئەو مەبەستە لە شاری هەولێر گۆڕستانی (چراغ)* مان وەرگرت. کە پێی دەچێ گۆڕستانێکی زۆر گەورەبووبێ، بەڵام ئێستا کراوە بەدوو بەشەوە بەشێکیان لە شێخەڵلایە ئەوی تریش هەر لەو سنوورەیە بەڵام لە نێوانی هەردوو بەشەکە حەفریاتێکی زۆر گەورە هەیەو ئێستاش کۆمپانیایەك خەریکی دروستکردنی باڵەخانەیە لەو جێگایە ئەوەش بۆتە مایەیی ئەوەی ئەم

(٥٤ ) دەڤەری کەرکووك و ناوچە شوێنەوارەکانی، خالید سابیر، گ. رامان، ژ٥، هەولێر، ٢٠٠١.

* گۆڕستانی چراغ وەك چۆن لە نامیلکەی هەولێردا هاتووە، ل١٦٦. دەربارەی مێژوویی دروست بوونی و ناونانی بە چراغ (د. مارف خەزنەدار) نووسیویەتی: وشەیەکی ئێرانیە بەمانای چرا، مۆم، رووناکی، ڕۆشنایی دێت، محمود ئاغای پیربەدری باپیرە گەورەی دکتۆر وتوویەتی: کابرایەکی ئێرانی ناوی (چراغ)ی هێناوە بۆ هەولێر، ئەوسا شوێنی ئەم گۆڕستانە ڕەزو باغ بووە، جا کابرای ئێرانی دەڵێ: بریا ئەم شوێنە خۆشە گۆڕستانی موسڵمان بوایە، جا پاش مردنی یەکەم کەس لەوێ دەنێژرێ، گوایە ناونانی بە (چراغ)یش لەبەر ئەوەیە شەوان بۆ شێخەکان و مەلاو ئەولیاکان کە لەوێ نێژراون چرایان بۆ دادەگیرسێ.

گۆڕستانە بەرەو لەناو چوون بچێ، بەهەر حاڵ ئەم گۆڕستانە لەناوەوە کۆمەڵێك حەوشەی لەخۆ گرتووە، هەر حەوشەیەك بەدیوار سنوور دراوەو دەرگایەکی هەیە، و بەزۆری هەر حەوشەیەك بۆ مردووی بنەماڵەیەك دانراوە. جگە لە گۆڕی ناو حەوشەکانیش گۆڕی تر هەیە لە نێوان ئەم حەوشانەو لەسەر ڕێگاکان و لەبەر ئەوەی گۆڕستانەکە زۆر کۆنەو گۆڕی زۆری تێدایە بەتایبەتی بەشەکەی لای شێخەڵلا سنووری نێوان حەوشەکان زۆربەی شکاوەو گۆڕەکان داڕووخاون و ئەو گۆڕانەی کە بەخشت دروست کراون و مێژوویییەکی زۆر کۆنیان هەیە زۆربەیان دیار نەماون، و هەر لەبەری شێخەڵلا گۆڕی پیاو چاکێکی لێیە کە بە بۆیەی سەوز قەفەس و گۆڕەکەی سەوز کراوەو ئاڵایەکی سەوزی بەسەرەوەیە، ئەم گۆڕستانی (چراغ)ە ئێستا لەناوەڕاستی شاری هەولێرەو دەوروبەری هەمووی بازاڕە.

هەر لە هەولێر چەندین گۆڕستانی تر هەیە، یەکێك لەو گۆڕستانانە خاکەکەی فرۆشراوە بە خەڵك هەر ١٠٠م و بنەماڵەیەك کڕییویەتی، ئەوانیش مردووەکانی خۆیان لەو جێگایە دەنێژن بۆ ئەوەی هەموویان لەتەنیشت یەکبن و گۆڕستانی خانەوادەی تایبەتی خۆیان بێت و تەنها مردووەکانی بنەماڵەکەی خۆیانی لێ بنێژن.

لە کەرکوك بۆ باسەکەمان سەردانی گۆڕستانی (شێخ محیالدین شێ محێ دین)مان کرد، ئەم گۆڕستانەش بریتییە؛ لە چەند گردو بەرزاییەك نزیکی یەك کە بە گۆڕ داپۆشراوەو زۆر گەورەیە، دەکەوێتە نێوان گەڕەکی ئیمام قاسم و ئیسکانی ئەم شارەوە، گۆڕستانەکە زۆر گەورەیە دوو جادە بەناویادێ لەبەر ئەوە بۆتە سێ پارچەوە و پارچەیەکیان بەدەم تەکیەی تاڵەبانییەکانەوەیە، و لەو گۆڕستانە کۆمەڵێك گۆڕی ناوداری تیادایە، گوایە یەکەم گۆڕ لەم گۆڕستانە گۆڕی (الامام محمد بن الامام موسی الکاظم)ە کە لە ساڵی (٢٠١) کۆچی کۆچی دوایی کردووەو لە ساڵی ١٤١٩ کۆچی گۆڕەکەی دۆزراوەتەوە ئەمە بەپێی ئەو زانیاریانەی لەسەر مەرقەدەکە تۆمار کرابوون، ئەم ئیمامە گۆمەزێکی بۆ کراوەو لە سەرەوەی گردەکەیەو مجێورێکی هەیە چوار شەموان دەرگای مەرقەدەکە دەکاتەوە تاکو خەڵك بچنە زیارەتی. لەنزیکی ئەویش گۆڕی براکەی هەبوو (ئیمام قاسم) هەندێ جار ناوی ئەویش بەکاردەهێنرێ بۆ گۆڕستانەکە جگە لەو گۆڕی شێخ (محی الدین)*یش هەر لەوێیە، ئەویش حەوشەیەکی بۆ کراوە و گۆڕستانەکە بەناویی

* لە کتێبی (هویة کرکوك الثقافیة والاداریة، محمد علي قرداغي، منشورات ئاراس، اربیل،٢٠٠٤، ص٥٥)دا هاتووە: شێخ محی الدین کوڕی شێخ حەسنی گڵە زەردی کەرکوکی بەرزنجییە لە ١١٣٣ کۆچی لەدایك بووە لە



ئەوەوەنراوە، و دەوروبەری ئەم مەزارانە گۆڕی مەلا و شێخ و سەیدو زانا ئایینییەکانی لێیەو ژمارەی گۆڕەکانی ئەم گۆڕستانە یەکجار زۆرە، و زۆرجار چەند گۆڕێك لەتەنیشت یەکەوە هەن یان لەناو قەفەسێك کە کەس و کاری یەکترن، بەڵام بەگشتی حەوشە حەوشە نەکراوە وەکو گۆڕستانی چراغی هەولێر.

پاشان چوینە سلێمانی و لە شاری سلێمانی چەندین گۆڕستان هەیە، مامە یارە، سەیوان، ..هتد. ئێمە گۆڕستانی (سەیوان)مان کردە مەبەست کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شارەکە و چەند گردێکی لێیە گردی یەکەمیان گۆڕی شێخ مارفی نۆدێ لێ بوو و کۆنترین گۆڕستان بوو لە نێوان هەرسێ گردەکە، گردی دووەم دەکەوتە تەنیشت گردی یەکەمەو بەمشیان دەوت سەیوان، بەڵام بەگردی شەهیدانیش ناسراوە یان شێخە بچکۆڵ.

گردی سێیەمیش هەر لەو نزیکە کە بەگردی ناوەڕاست ناسرابوویان گۆڕستانی کاسە و کەوچکیان پێ دەوت، و هەندێ کەس ئەمیشیان بەسەیوان دادەنا و لە زۆر کەسم پرسی لە دانیشتوانی ئەو دەوروبەرەو لە قورئان خوێن و ئەو گۆڕ هەڵگرانەی لەوێ بوون، بەڵام قسەکانی هیچ کامێکیان یەکی ناگرتەوە هەر کەسەو گردێکی دانابوو بە گردی سەیوانی یەك و ئەوانی تر بە سەیوانی دوو سێ یاخود ناوی تری بۆ بەکاردەهێنا، بەڵام بەپێی مێژووەکەیان بۆم دەرکەوت کە ئەو گردەی کە شێخ مارفی لێیە ئەوە گردی سەیوانی یەکەو ئەوانی تر دوو.. سێیە. هەر لەم بارەوە مامۆستا عبدالرقیب یوسف بەم شێوەیە باسی کرد: (لەسەرەتای دروستبوونی شاری سلێمانی گۆڕستان نزیك تربوو لە شار چونکە شار بچووك بوو، بەڵام پاش ماوەیەکی زۆر ئینجا شار گەورەوە بوو و سەیوان بوو بە گۆڕستان، و بەتەئکیدیش قەبر هەبووە لە سەیوان لەسەردەمی (ئەحمەد پاشا)ی بابان چونکە کە ئیمارەتەکەی نەما لەوێ نێژراو لەو کاتەشدا گۆڕی شێخ (معروف نۆدەهی) لەوێ بوو، ئەوکات تەنها گۆڕی ئەوانی لێ بوو و پاش ٢٠- ٣٠ ساڵێك بە تەواوەتی بوو بە قەبرستان و لە سەرەتادا گردی سەیوان بەر لەوەی قەبرستان بێ ڕەزبوو.).

دێی گڵە زەردە لە قەرەداغی سلێمانی، لەلای باوکی خوێندویەتی و شارەزاییەکی زۆری پەیاکردووە. زانایەك بووە دنیای بەجێ هێشتووەو بۆ خزمەتکردنی زانست خۆی تەرخان کردووە، کۆمەڵێك بەرهەمی جێی هێشتووە لە بارەی پزیشك و ئایین...هتد. لەوانە: (جمع الجواهر ٤مجلدات، الاوفاق والطب ودفع الشیطان، صلاح النفوس واداب السلوك في الطریقة القادریة، تسهیل الصعاب...هتد).

ئێستاش گردی سەیوان دارێکی زۆری لێیە دار ئەرخەوان و دار قەزوان و... تد. و گۆڕستانێکی یەکجار چڕو فراوانەو کۆمەڵێك لە ڕۆشەنبیرانی ئەو شارەی لەخۆ گرتووە.

ئەمجارەیان بەرەو دهۆك، لە دهۆك چوینە گۆڕستانێك کە لەناو بازاڕی دهۆك دابوو و لە زۆربەی خەڵکی دهۆکیشمان پرسی بۆ ئەوەی ناوی گۆڕستانەکەمان پێ بڵێن کەچی خۆشیان نەیان دەزانی. ئەم گۆڕستانە دەکەوێتە گەڕەکێکەوە پێی دەوترێ (محلا قەرەجا)و گۆڕستانەکە هەر ئەوەتە ئاساری ماوە، زۆربەی گۆڕەکانی هەر دیار نەماوە، تەنها گۆڕێك کە زۆر بەزەقی دیاربوو و قەفەسێکی بۆ دروست کرابوو ئەویش لەسەر شۆستەکە بوو ولەسەری نوسرابوو (سید محمد سید محمود) من وێنەی ئەم گۆڕستانەم گرت و چووین بەرەو گۆڕستانی گەورەی دهۆك کە ناسراوە بە (شاخکی) کەمێك لەشار دەردەچیتە دەرەوە بەرەو ڕۆژئاوا، شوێنێکە هەمووی بەرزی و نزمییە جا مردووەکان زیاتر لە شوێنە بەرزەکان نێژراون و لەشوێنی وا نێژراون کە ڕەچاوی ئاوی بارانیان کردووە گۆڕەکانیان هەڵنەتەکێنی وتێکی نەدات. سنووری گۆڕستانەکە زۆر فراوان بوو و شورایەکی جوانی بۆ کراوە، خەڵکی دهۆك هەموو مردووەکانی خۆیان لەوێ دەنێژن.

دیارە ئەمەی کە باس کرا چەند گۆڕستانێك بوو و بێگومان گۆڕستانی تر زۆرەو باس کردنی هەر هەمووی کارێکی زۆر زەحمەتە.

بەگشتی گۆڕستان شوێنێکی تایبەتە بۆ ناشتنی مردوو. زۆرجار شوێنی بەرزی بۆ هەڵدەبژێردرێ دیارە بۆ مەبەستی بەرز ڕاگرتنی پاکی گۆڕستانەکەیەو سەرەڕێ نەبێ، و لە زۆربەی گۆڕستانەکان دار دەچێنرێ لەلایەن کەس و کاری مردووەکەوە، و پێنج شەموان یا جومعەکان خەڵکی دەچنە زیارەتی مردووەکانیان لەم گۆڕستانانە و هەر گۆڕستانێك کۆمەڵێك فەنتازیاو حیکایەتی خەیاڵی پێوە لکاوە، کە خەڵکەکە لەخەیاڵی خۆیانەوە بۆیان دروست کردووە.

## گۆڕ:

هەر لە کۆنەوە گۆڕ دواین جێگای مردوو بووە، و هەموو ئەو میللەتانەی کە مردووەکانیان ناشتووە لە گۆڕیان ناوە، بە تێپەڕبوونی کات و پێشکەوتنی شارستانییەت و عەقڵیەتی مرۆڤ گۆڕەکانیش گۆڕان کاریان بەسەردا هاتووە تا گەیشتە ئەم شێوەیەی ئەمڕۆی، ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین گەشتێکی خێرا بکەین بەناو جیهانی گۆڕدا تا دەگەینە ئەو شێوازەی کە ئەمڕۆ پەیڕەو دەکرێ.



## کورتە مێژوویەکی گۆڕ:

هەر لەسەرەتاوە کە مرۆڤ بیری لە ناشتنی مردووکردۆتەوە تا دەگاتە ئەمڕۆ چۆنیەتی دروستکردنی گۆڕ چەندەها شێوەیی بە خۆوە بینیوەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە لەوانە زۆریان لە شێوە ئاساییەکەی لایان داوەو ئەمڕۆ بۆ ئێمە شتێکی سەیرەو جێی لێکۆڵینەوەو بایەخ پێ دانە. بۆ نموونە لە گۆڕستانی پادشایەتی (ئور) دا سەرباری هەزارەها گۆڕی تر (١٧) گۆڕی نا ئاسایی دۆزراونەتەوە کە مێژووەکەی بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زاین دەگەڕێتەوە، ئەو گۆڕانە کە بەگۆڕی پادشاکان ناسراون لە گۆڕە ئاساییەکانی تر قوڵترن و تەرمی زیاتریان تیادا بووە، یەکێك لەو گۆڕانە بە گۆڕی مردنی گەورە ناونراوە کە تەرمی ٧٤ کەسی تیادا بووە، گۆڕەکەش بریتی بووە لە ژوورێك لەژێر زەوی بە قوڵایی یەك یاردە= ٩١سم و ڕووبەرە گشتییەکەی ١٤م بووە، و لەرێی ڕێڕەوێکەوە دەگاتەوە سەر زەویی و لەناو گۆڕەکەدا تەرمە سەرەکییەکە گۆڕێکی بەردینی بۆ دروست دەکرێ لەناوەڕاستی ژوورەکە کە تەرمی پاشایە، و جگە لەو تەرمەش تەرمی ئەو کەسانەی تیادایە کە خۆیان کردۆتە قوربانی بۆ پاشاو لەگەڵیدا خۆیان کوشتووە، و ئەم خۆ بەقوربانی کردنە تەنها کۆیلەکان و کارەکەرەکانی نەگرتۆتەوە، بەڵکو کەسی نزیکی (پاشا)ی لەگەڵ دایە کە خۆیان کردۆتە قوربانی بۆ ئەوەی لەگەڵ پاشادا بمرن و لەگەڵ ئەویشدا زیندوو ببنەوە[٥٥].

هەروەها لە گۆڕستانەکەی (اریدۆ)ش لێکۆڵینەوە لەسەر ٢٠٠ گۆڕ ئەنجام دراوە، ئەم گۆڕانە لە ڕێڕەوێکی لاکێشەییدا دروست کراون و بە خشت داپۆشراون، مردووەکان لەسەر پشت لەناو گۆڕەکە دادەناو پاشان سەری گۆڕەکەیان دەگرت، زۆرجاریش سەگی مردووەکەیان لە تەنیشت گۆڕەکە داناوە.

لەباکووری ڕۆژهەڵاتی شاری (موسڵ) لە تەپە گەورا کە نزیکی (١٥)کم لە شارەوە دوورە، گۆڕستانێکی یەکجار زۆریان لەوێ دۆزیوەتەوە کە زۆربەیان چاڵێکی ئاسایی بوونە بۆ مردوو ناشتن لە دەرەوەی پەرستگاکان، هەروەها مردووەکانیان بە شێوەیەکی کۆکراوەیی لەناو گۆڕەکە داناوە، و ئەوەی منداڵیشە لە گۆزەنراوەو لەژێر خانۆکاندا نێژراوە، بەڵام ئەو کەسانەی کە ناوداربوونە جێگایەکی تایبەتی بۆ گۆڕەکانیان دروست کراوە، لە شوێنێکی بەرز (لەسەر گردێك) هۆدەیەکی لاکێشەییان لەخشت یان بەرد بۆ دروست کراوەو سەرەکەیان بەدار یان بەرد

(٥٥ ) نهێنییەکانی گۆڕستانی پادشایەتی ئور، تاهیر عوسمان، گ؛ شانەدەر، ژ١١، هەولێر، ٢٠٠٠.

گرتووەو هەر گۆڕێك یەك لاشەی تیادا بووەو مردووەكە بە شێوەیەكی چەماوەو بەجل و بەرگەكەیەوە لە ناویدا دانراوە زۆرجاریش لە حەسیرێك لوول دراوە. هەروەها لە شاری هەولێر لە گەڕەكێكی ناسراو بە (حەی عەسكەری) نزیكی گردی (كلك مشك) گۆڕستانێك دۆزراوەتەوە كە لە جۆری گۆڕە بە كۆمەڵەكان بووە، ئێسكی ٦- ٧ كەسی تیادا دۆزراوەتەوەو گۆڕەكە لە كەرپوچی گەورە دروست كراوەو مێژووەكەی بۆ سەردەمی (فرثیە)یەكان دەگەڕێتەوە[٥٦]. فرثییەكانیش كۆمەڵە خەڵكێك بوونە لە باكووری دەریایی قەزوینەوە هاتوون و دەسەڵاتیان بەسەر عێراق و ئێراندا هەبووە پاش نەمانی دەسەڵاتی (سلوقی)یەكان.

ئەم جارە بابینە لای میسیرییەكان كە خاوەن گەورەترین كەلچەڕی گۆڕو گۆڕستانن، و سەرەتا لە میسری كۆندا گۆڕی پاشاكانیان بریتی بوو لە چاڵێك لەژێر زەوی كە بەخشت هەڵچنرابوو و سەرەكەی لەسەر ئاستی زەوی بەدار دەپۆشراو كۆمەڵێك بەرد و خۆڵیان كردۆتە سەری.

پاشان لە سەدەی بیست و نۆیەمی پێش زایین ئەندازیاری بیناساز (امتحب) گەورەترین و كۆنترین گۆڕی دروست كردووە لەبەرد كە تا ئەمڕۆش بەیەكێك لەشتە سەرسوڕهێنەرەكانی جیهان دادەنرێ، ئەم گۆڕە كە یەكێكە لە ئەهرامات بۆ (زوسر)*ی پاشا دروست كراوە، بەرزییەكەی نزیكەی ٢٠٠ پێیەو ڕووبەرەكەی بەگشتی (٣١فەدانە) لە تاشە بەردی زۆر گەورە دروست كراوەو لەناوەوەش چەندەها جێگای تیادایە بۆ دانانی (مۆمیای پاشاكە) و سەروەت و سامانەكەی، ئەهراماتی فرعەونییەكان ئەو داهێنانە مەزنەیە كە تا ئێستاش جێی سەرسوڕمانی مرۆڤە و ئەو گۆڕە گەورانە بەسەیرترین جۆری گۆڕ دادەنرێ لە هەموو جیهان كە تا ئێستاش هەموو نهێنییەكانی هەڵنەهێنراوە[٥٧]. جگە لە ئەهراماتیش گۆڕی (تاج محل) لە هیند داهێنانێكی مەزنی ترە، كە ئەمڕۆ یەكێكە لە ناوەندە سەرنج ڕاكێشەكانی جیهان.

لەگەڵ دەستپێكردنی چاخەكانی مێژوو، بۆ ناشتنی مردوو دەستیان بە بەكارهێنانی تابوت كرد. كە لەقوڕ یا دار دروست دەكراو لاشەی مردووەكانیشیان بە حەسیر لول دەدا و ئەگەر مردووەكەیان لەناو گۆڕ بنایە، ئەوە ناوی گۆڕەكەیان هەموو بە حەسیر دادەپۆشی، لەلایەكی تر

(٥٦ ) طریقة دفن الموتي في كردستان وجنوب العراق، زبیر بلال اسماعیل، گـ. شانەدەر، ژ٨، هەولێر، ١٩٩٨.

* (زوسر) پاشایەكی میسریە ٢٩ ساڵ دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، مرۆڤێكی زانا بووەو بیناسازی و ئەدەبی خۆشویستوە، زۆر بەناو بانگ بووە لە میسر، میسرییەكانیش خۆی و خواوەندەكەیان دەپەرست.

(٥٧ ) انتصارات الحضارة- تاریخ الشرق القدیم، ص٨٦.



زۆربەی ناوچەكانی ڕۆژهەڵاتی عەرەبستان بۆ ناشتنی مردوو كوپەیان بەكاردەهێناو منداڵیشیان لەسەبەتە دەناشت[٥٨].

دیارە مردوو ناشتن لەناو كوپە نەریتێكە لەزۆر شوێندا پەیڕەو كراوە، لای زەردەشتییەكان وەكو چۆن باسمان كرد كوپە بەكارهاتووە بۆ پاراستنی ئێسك و پروسكی مردووەكان. هەروەها لە ئەنجامی لێكۆڵینەوەیەك كەلەسەر گۆڕەكانی (قالیج ئاغا) لە هەولێر كراوە، چەندین گۆڕ دۆزراوەتەوە كە زۆربەیان بریتی بوونە لەجەڕەیی گەورەو بەشێكیان لە خشت دروستكرا بوون. جەڕەكانی زۆربەیان ڕەنگی (زەرد یا زەردی تۆخ یا كەسك یا قاوەیی مەیلە و كەسك) یان هەبووە، و ئەم گۆڕانەی كە لەخشتیش دروست كرابوون زۆربەیان لاكێشەیی بوونەو یەكێك لەو گۆڕانەش پانییەكەی ٤٤سم و درێژییەكەی ١,٣٠م بووە[٥٩].

جا لە كوردستان شێوازی ئەم گۆڕانە زۆرە و هەر چەند لێكۆڵینەوەی ئاساری بكرێت دیارە شتی تازەتر بەدەست دێنن، چونكە كۆمەڵێ نهێنی هەیە هێشتا شاراوەیە. ئەوەی كە باسكرا كورتەیەك بوو لە شێوازەكانی گۆڕ بەپێی شوێن و سەردەمی جۆر بەجۆر، بەلاٚم لەگەڵ سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام و بڵاوبوونەوی، هەموو موسڵمانان یەك شێوازە ناشتن و لە گۆڕنان پەیڕەو كردووە بۆ ناشتنی مردووەكانیان.

پەیڕەوكەرانی ئایینی مەسیحیش مردووەكانیان بەهەمان شێوە دەنێژن، بەڵام زیاتر بەتابووتەوە مردووەكە دەنێنە چاڵ و لەبەشێكی تایبەتیدا لەم باسە باسی ڕێو ڕەسمی مردوو ناشتن لەلای ئەوانیش (مەسیحییەكان) دەكەین.

هەر سەبارەت بە مردوو ناشتن. (ڕۆدینكۆ) ئاماژە بەوە ئەكات گوایە لە ڕابردوودا دوور نییە كورد مردووی لە صندوقدا ناشتبێ یاخود بە صەندوقەوە نابێتیە ناو گۆڕ، (جەلال تەقی)یش لە وتارێكیدا بەڵگە بۆ ئەم قسەیەی (ڕۆدینكۆ) دێنێتەوە، بەڵگەكەشی دێرە شیعرێكی (ئەحمەدی خانی)یە لە (مەم و زین)ەكەیدا:

حاصل ڤكرن ژ نۆڤە صندوق          میرگوتە می ژ بوتە معشوق[٦٠].

(٥٨ ) http://www.soriana.com/modules/news/atide.php?storyid=2596

(٥٩ ) كۆمەڵە گۆڕێكی قالیج ئاغا لە هەولێر، شا الصیوانی، گـ: شانەدەر، ژ٣، هەولێر، ١٩٩٧.

(٦٠ ) لاوانەوەی كوردی و دەوری (ڕۆدینكۆ) لە تۆماركردنیدا، جەلال تەقی، گ: كاروان، ژ٥١، هەولێر، ١٩٨٦.

بەڵام ئێستا مردوو ناشتن و گۆڕ دروست کردن لە کوردستان بەپێی ڕێ و شوێنی ئایینی ئیسلامەو ناشتنەکەش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێ:

پاش ئەوەی مردوو دەشوردرێت و کفن دەکرێت دەبردرێت بۆ گۆڕستان. لە گۆڕستان گۆڕێك بۆ ئەم مردووە حازر دەکرێ، ئەم گۆڕە بریتییە لە چاڵێکی لاکێشەیی قوڵاییەکەی پێوانەیەکی دیاریکراوی بۆ دانەنراوە، بەڵام بە گشتی درێژایی بەژنێکی بۆ دیاریکراوە یاخود ڕای تر هەیە دەڵێ: قوڵاییەکەی بگاتە لای ئاستی ناوکی مرۆڤ یان تۆزێك سەرەوەتر، واتە قوڵاییەکە هەر لە دەوری (١,٥- ٢)م دایە، و ئەگەر مردووەکە ئافرەت بێ گۆڕەکەی قوڵتر دەکرێ لە گۆڕی پیاو بۆ گۆڕی منداڵیش زۆرجار هەمان قوڵایی بۆ لێ دەدرێ یاخود کەمی کەمتر. بە گشتی باشتر وایە هەتا دەکرێ و لەتوانا دایە گۆڕەکە قوڵایی و پانی زیاتر بێ فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) هەیە لەم بارەوە دەڵێ: (احفروا واسعوا واعمقوا واحسنوا...) [٦١]. واتە: هەڵکەنن باش و فراوان و قوڵی بکەن، و هەر لەناو گۆڕکەش شوێنێك بۆ تەرمەکە حازر دەکرێ ئەمەش دوو ڕێگای هەیە، دەکرێ چاڵێك لەناو گۆڕەکە هەڵکەنن بەدرێژایی گۆڕەکە، بەڵام بەپانییەکی کەمتر بە شێوەیەك دوو دیوار بمێنێتەوە لەملاوەو لەولای چاڵەکە بۆ ئەوەی بەردەکانی لەسەر ڕیز بکرێ بۆ داخستنی چاڵەکەو هەندێك خۆڵ دەهێڵنەوە بۆ ئەوەی پاشان سەری مردووەکە بخرێتە سەری لەناو چاڵەکە ئەمەش پێی دەوترێ (الشق)، (اللحد)یش هەیە ڕێگایەکی ترە ئەمیان لە دیواری گۆڕەکە کە دەکەوێتە بەرامبەر قیبلە چاڵێك دەکەن بۆ ئەوەی مردووەکەی تیا بکرێ پاشان بەتاشە بەرد دایدەخەن.

پاش ئەوەی گۆڕ حازر بوو مردووەکە دەخرێتە ناو گۆڕەکە لەلایی پێی گۆڕەکەوە، باشتر وایە کەسێکی نزیکی مردووەکە دابەزێتە ناو گۆڕەکەو مردووەکە لەسەر تەنیشتی ڕاستی ڕووی بەرەو قیبلە دادەنرێ و دەبێ بڵێ (بسم الله و علی سنه او علی مله رسول الله). پاشان سەر (اللحد)ەکە دەگرن بەخشت یاخود بە چەمەنتۆ قاڵبی بۆ دروست کراوەو بانی دەدرێ بە باشی دوایی بە خۆڵ گۆڕکە پڕ دەکرێتەوە، ئەو خۆڵەش دەبێ بەرز وەبێ لەسەر ئاستی زەویی و لوتکەیەکی پێ دروست بکرێ. کردەی ناشتنی مردوو ناکرێ ئافرەت ئەنجامی بدات، چونکە پیاو خۆ ڕاگرترەو بە تواناترە بۆ ئەم کارە.

(٦١ ) صحيح فقه السنة وادلته وتوضيح مذاهب الائمة، ص٦٦١.



گۆڕ بۆیەك مردوو تەرخان دەکرێ، بەڵام لەکاتی ناچاریدا جائیزە دوو مردووی تیا بکرێ، گوایە شەهیدەکانی شەڕی (احد) پێغەمبەر (د.خ) خۆیی دوو دووکردو نییەتیە ناو یەك گۆڕەوە.

بۆ ئافرەت و پیاویش پەسەند نییە بەیەکەوە بنێژرێن و ئەگەر نێژران ئەوە دەبێ لەناو گۆڕەکە لە نێوانیاندا دیوارێکی خۆڵ هەبێ و پیاوەکە لە پێشەوە دادەنرێ و ئافرەتەکەش لە پاشی.

پاش ئەوەی چل ڕۆژ بەسەر ناشتندا تێ دەپەڕێ، گۆڕەکە هەڵدەگرترێ ئەگەرچی لە ئیسلامیشدا پەسەند نییە هەڵگرتنی گۆڕ، بەڵام ئەگەر شتێك دابنرێ بۆ ناسینەوەی گۆڕەکە ئەوە ڕێگای پێ دەدرێ وەك دەگێڕنەوە (پێغەمبەر) (د.خ) کاتێ (عوسمان بن مظغون) دەمرێ پاش ناشتنی بەردێکی گەورە لای سەر گۆڕەکەی دادەنێ و دەڵێ: (اتعلم بها قبر اخي وادفن اليه من مات من اهلي) واتە؛ گۆڕی براکەمی پێ دەناسمەوەو کێ لە کەس و کارەکانم مردن لای ئەم دەیانێژم) [٦٢].

هەر لەبەر ئەمە زۆرجار لە گۆڕستانەکان دەبینن تەنها کێلێك بۆ گۆڕەکان کراوە یاخود کەمێك لەسەر ئاستی زەویی بەرز کراوەتەوە.

بەڵام گۆڕەکانی تر هەڵدەنرێ و شێوازو مۆدێلاتی جۆر بەجۆری بۆ بەکاردەهێنرێ و لە جۆرەها بەردی کاشی و حلان و مەڕ مەڕ و چەمەنتۆ.. هتد. کێل و گۆڕ دروست دەکەن و بەجۆرەها خەت نووسینی لەسەر دەنووسرێ لەبەشەکانی داهاتوودا زیاتر باسی لێوە دەکەین.

**شێواز- فۆرمای گۆڕەکان:**

لە سەرەتای باسەکەوە چەندین شێوازو جۆری گۆڕمان باسکرد کە لە مێژوویەکی کۆندا هەبوون و هەتا ئێستاش ئاسەواریان ماوە لە ئەهراماتی میسرەوە بۆ گۆڕی بابلییەکان و ئاشورییەکان و زەردەشتی... هتد. هەروەها باسی هەندێ لەو بۆچوونانەمان کرد کە مرۆڤەکان سەبارەت بەدیاردەی مردن لەلایان دروست بوو بوو، جا ئێستاش هەوڵدەدەین باسی شێوازی گۆڕەکانی ئەم سەردەمە بکەین لەناو گۆڕستانەکانەوە ئەمەش بۆ خۆی دەبێتە ئاوێنەیەك کە ڕەنگدانەوەی هەموو بیرەکانی مرۆڤی تیادا بەدی دەکرێ.

(٦٢ ) صحيح فقه السنة وادلته وتوضيح مذاهب الائمة، ص٦٦٤.

ئاشکرایە لە ژیاندا کۆمەڵگا پێکهاتەیەکە چین و وتوێژی یەکجار زۆر بەشداری تیا دەکەن بە پلەو پایەی ڕۆشنبیری و ئابوری و ڕامیاری جیا جیا ئەم جیاوازییانە جیهان بە چەندین ڕەنگی جۆراو جۆر ڕەنگ دەکات. جا کاتێ باسی گۆڕستانیش دەکرێ لە دەرەوەی بابەتەکەوە ڕاستەوخۆ بە ئەو جێگایەی دادەنەی کە مرۆڤەکان تیایدا یەکسانن، یەکسانییەکەیان لە مردن دایە. هەموویان مردوون و لەژێر خاك دان و دەسەڵاتیان نییە، ئەمە بێ گوێدانە چاکەو خراپەی مردووەکە تەنها وەکو باسکردنێکی مجرد بۆشتێکی مادیی. بەڵام کاتێ لە نزیکەوە بە گۆڕستان ئاشنا دەبیت و بە وردی تێی ڕادەمێنی، سیستەمێکی دیکە لە چینایەتی و ئاستی کۆمەڵایەتی جیاوازت بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەمجارەیان چینایەتییەك بۆ کۆمەڵگای مردووەکان، هەڵبەتە دەستی مرۆڤایەتی (کەسە زیندووەکان) ئەو چینایەتییەیان لە گۆڕستاندا دروست کردووە، بەڵام لێرەدا هەموو شتەکان بێ دەنگن و بێ جووڵەن ئەگەرچی بە فۆرم بوونیان هەیە، جا لە گۆڕستانیش دەوڵەمەند هەر دەوڵەمەندەو هەژاریش هەر هەژارە سەرەڕای ئەوە ئاستی ڕۆشنبیری و باوەڕو ئایین و داب و نەریت ڕەنگی بەهەموو لایەکی گۆڕستاندا هێناوە، بەڵام بەهەر حاڵێك مردن کۆتایی هەموو پەیوەندییەکانە لەگەڵ ژیان ئەگەرچی مرۆڤ نایەوێ دان بەوە دابنێت، جا لەبەر ئەوە لەڕێی گۆڕستانەوە دەیەوێ جۆرێك لە پەیوەندی دروست بکاتەوە.

لە گۆڕستان نووسینی سەر گۆڕەکان مێژووت بۆ دەخوێننەوەو بەها کۆمەڵایەتییەکانت بۆ دەستنیشان دەکەن، (شکل- فۆرم- شێواز)ی گۆڕەکانیش لە عەقڵییەت و بیرکردنەوەی مرۆڤەکان دەدەوێن. هونەر و دەست نەخشینی و ڕەنگ و وێنەکانیش بێ بەش نین لەبوونیان لەناو گۆڕستانی کپ و خامۆش.

ئەگەرچی ژمارەی گۆڕەکان یەکجار زۆرن و گۆڕستانەکانی کوردستانی باشووریش زۆرە، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین لەناو ئەو گۆڕستانانەی کە لەسنووری کارەکەماندا بووە باس لەهەندێ نموونەی گۆڕ بکەین و لەمەڕ شێوازەکانی گۆڕ دروست کردن هەندێك ڕوونکردنەوە بخەینە بەردەست.

سەرەتا لە گۆڕستانی نەبی (دانیال)وە دەست پێ دەکەین کە دەکەوێتە سەر قەڵای کەرکوك، ئەوەی کە هانیدام بۆ بینینی ئەم گۆڕستانە بچم وتارێکی (مامۆستا عبدالرقیب)بوو کە لە گۆڤاری هەزار مێرد بڵاویی کردۆتەوەو باسی گۆڕستانی (با بجیجك) دەکات و باسی گۆڕەکانی نەبی (دانیال)یش دەکات. مامۆستا باسی گۆڕی سۆفی (سەربەپەڕ) دەکا لە



قەبرستانی (با بجیجك) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوایی شەقڵاوە. ئەو سۆفیە ناوی نەزانراوەو ناوی کوڕەکەی (کارەسول)ە، ئەم دوو قەبرە نزیك گۆشەی ڕۆژئاوایە بەرزی کێلەکانیان (١م× ٤٠سم) بووە. دەوریی دە پەیکەری بەردی مێزەر عمامە لەوێ کەوتوون و نەزانراوە کامی هی سۆفیە. مامۆستا پێی وایە ئەو مێزەرانە تەرزی مێزەرەکانی مەلاو شێخەکانی کوردستان نین، بەڵکو تەرزی مێزەرو سەرو کڵاوەکانی عوسمانییەکانە، لە بۆتان و ئیستامبول هەمان ئەو تەرزە هەیەو لە گۆڕستانی سەر قەڵای کەرکووك هەمان ئەم کێلانە هەن کەسەرە کێڵەکەیان بە شێوەی مێزەرە. گۆڕەکانی سەر قەڵای کەرکووك کە لەم شێوەیە بوون گۆڕی (الحاج محمد لوطفي پاشا)و (مستەفا نافذ) بووە، کەسەر کێلەکانیان سەر کڵاو فێس و تەرزی عوسمانین و زۆر کۆنن[٦٣].

من چوومە سەر قەڵای کەرکووك بۆ ئەوەی ئەو کێلانە ببینم. جا لە گۆڕستانی نەبی (دانیال)دا گۆڕەکانم بینی دیارترینیان گۆڕی (الحاج محمد لطفي پاشا بن الشیخ عبدالله)یە کە لە (١٠٣٤)ك کۆچی کردووەو فەرماندەی فرقەی دووەم لە فەیلەقی شەشەمی جەیشی عوسمانی بووە. گۆڕەکەی نزیکەی ١٨٠سم درێژ بوو، و کێلەکەی لای سەری هەر وەکو کێلێکی ئاسایی لەبەرد دروست کراوە و بەختی (جلی الثلث) لەسەری نووسراوە، بەڵام لەسەرەکەی سەر کڵاوێك هەیە. ئەگەرچی ڕادەیی درێژیەکەی زۆرترە لەسەر کڵاویش، ئەم سەرە کێڵە لەبەرد دروست کراوە بە شێوەیەکی لوولەیی و نەخشی بەسەرەوەیە بڕوانە (وێنە-١).

جگە لەم گۆڕە، گۆڕی تری لێیە، بەڵام زۆربەی شکابوون و نووسینەکانی بەسەرەوە دیار نەمابوو یان بە زەحمەت دەخوێنرایەوە (وێنە-٢). شایەنی باسە لە گۆڕستانی سەیوان لە سلێمانی گۆڕێکی دیکەمان بینیەوە کە سەرە کێڵەکەی بە شێوەی کڵاو بوو و گۆڕەکە گۆڕی ئەفسەرێکی کۆن بوو بە ناو (عبدالقادر عزت عبدالرحمن) کە لە ساڵی (١٩٧٨) کۆچی کردبوو، سەر کێلەکەش وەك دیار بوو شکاوەو بە چیمەنتۆ چاك کرابۆوەو لەسەر کێڵەکە دانرابوو بڕوانە؛ (وێنە-٣).

(٦٣ ) صلاح الدین ئەبوبی خەڵکی دوینی ئەرمەنستان نەك دوینی هەولێر، عبدالرقیب یوسف، گــ، هەزار مێرد، ژ١١، سلێمانی، ل ؟.



(وێنەی -١) گۆڕێکی ناو گۆڕستانی نەبی (دنیال) قەلاّی کەرکوك.



(وێنەی -٢) کۆمەڵە گۆڕێکی حەوشەی مزگەوتی نەبی (دانیال) قەلاّی کەرکووك





(وێنەی -٣) گۆڕستانی سەیوان سلێمانی

لەناو مزگەوتەکە نەبی (دانیال)یش سێ گۆڕی لێ بوو (عزیز، دانیال، حنین) کە گۆڕی سێ پێغەمبەر بوون، هەر یەکێك لەو گۆڕانە کۆمەڵە بەردێکی ڕیزکراو بوو و بەپارچە قوماشێکی سەوز داپۆشرابوو. دیارە ڕەنگی سەوز ڕەنگی سەیدو ئەولیاکانە و بۆ پیاو چاکان دادەنرێ (وێنە-٤).




(وێنە - ٤) گۆڕی نەبی (عزیر) لەناو مزگەوتی نەبی (دانیال) قەلاّی کەرکووك

هەر لەسەر قەلاّی کەرکووك گۆڕێکی تەنهای لێ بوو کە بەپێی قسەی چەند کەسێك لە دانیشتووانی قەلاّکە دەیانوت ئەوە گۆڕی کچی (ملك)ەیەکە، بەلاّم ناوی لەسەر گۆڕەکە دیار نەمابوو (وێنە ٥-أ) ئەم گۆڕەش بینایەکی شەش گۆشەیی بۆ دروست کرابوو قەدەکەی هەمووی نەخشێنرابوو بە شێوازێکی جوان و بەتەنیا لەناو حەوشەکەیدا بوو بە پەیژە بۆ ناو حەوشەکە سەردەکەوتی (وێنە -٥- ب) بەختی (ثلث) لەسەر بینایەکە نووسرابوو، بەلاّم ناوی کچەکە و باوکی دیار نەما بوو تەنها ئەوەندە تێگەیشتم کە لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا کۆچی کردووەو کچی الحاجیە بغداد خاتوون بووە، لەناو بیناکەش گۆڕەکەی هەبوو کۆمەڵە بەردێکی شێواو لەسەر یەك بەقسەی کەسێکی ئەوێ گوایە ئەمریکییەکان پاش ئازادی عێراق ئەم گۆڕەیان هەڵداوەتەوە، دیارە خۆیان بە تەمایی ئاسار کردووە، بەلاّم کە هیچیان نە دۆزیوەتەوە بانیان داوەتەوە، وا دیارە دزەکانی پێش ئەوان ئاسارەکانیان بردووە ئەوە ئەگەر لە بنەڕەتا خۆی ئاسار هەبووبێ لە گۆڕستانی (چراغ)ی هەولێریش جۆرێك لە تەرزی گۆڕ دەست دەکەوێ کە



(وێنە -٥-أ) گۆڕی کچی (مەلیکە)یەك لەسەر قەلاّی کەرکووك





(وێنە -٥-ب) گۆڕی کچی (مەلیکە)کەی سەر قەلاّی کەرکووك لە دوورەوە.

لەخشت دروست کراون مامۆستا (عبدالرقیب) مێژووەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم، ئەم گۆڕانەی کە لەخشت دروست کراون نزیکەی ٢٠سم یان زیاتر لەسەر زەوییەوە دیارە، ئەگەرچی زۆربەی ئەم گۆڕانەش هەر ئەوتا ئاسارییان دیارە چونکە لەناو خۆڵ و قوڕدا نوقم بوونە. لە نزیکی هەندێکیان کێل کەوتبوون دیار بوو هی ئەم گۆڕانە بوو (وێنە -٦-أ)، بەلاّم زۆربەیان وەکو باسم کرد دیار نەمابوو یاخود گۆڕی تر لە جێگاکانیان دروست کرابوو. ئەم گۆڕانەش کە بەخشت دروست کراون، خشتەکەی بە شێوەیەکی ڕێك و بەنەخشەوە بە درێژایی گۆڕەکە دانرابوو (وێنە-٦-ب)

ئێمە وتمان لەناو گۆڕستانیشدا چینایەتی هەیە جا بابزانین ئەم چینایەتیە چۆنە.

سەرەتا ئەو گۆڕانەی کە گۆڕی سەیدو شێخ و مەلاو پیاو چاکن لە هەموو گۆڕستانەکان گۆڕەکانیان جیاوازە لە گۆڕەکانی تر یا ئەوەتا گومەزیان بۆ کراوە یاخود ئالای لەسەر هەڵواسراوە یا هەر نیشانەیەکی تر کە دەلالەت بێ لەسەر گۆڕی پیاوچاکان.

له گۆڕستان (چراغ) چەندین گۆڕ هەبوو ئاڵایی بەسەرەوە بوو لەوانە گۆڕی (سەید سەعید حەسەن) (وێنە-٧) کە تەنیشتەکانی گۆڕەکەی بەڕەنگی سەوز ڕەنگ کرابوو و ئاڵایەکی سەوز لەلای سەرییەوە چەقێنرابوو.

هەروەها گۆڕی (وێنە-٨) کە هی ئافرەتێك بوو باوکی شێخ بوو ئەمیش بەتەنیشت گۆڕەکەیەوە چەندین پارچە پەڕۆ بە بۆ ڕیەکەوە هەڵواسرابوو لەلای سەرییەوە گۆڕەکەش بە بەردی حلان دروست کرابوو، هەردوو سەرە کێلەکە وەکو گومەز لێ کرابوو دەوروبەری گۆڕەکەش چیمەنتۆکراوە.

له گۆڕستانی (شێخ محی الدین)ی کەرکووکیش، گۆڕی شێخ محی دین خۆی لەناو حەوشەیەکدایە دیوارو دەرگای هەمووی بە سەوز ڕەنگ کراوە.



(وێنەی -٦-أ) دوو گۆڕی لەخشت دروست کراو لەتە بەردەکەش کەرتە کێلی شکاوە، بەڵام ئەم کێلانە بچووکترن لە کێلی ئێستا: (گۆڕستانی چراغ- هەولێر).





(وێنە-٦-ب) گۆڕێکە بەخشت دروست کراوە خشتەکە بەڕێکی هەندێکی لەسەر درێژی و هەندێکی لەسەر پانی ڕیز کراوە، تەنیشتەکانی لەسەر سێ ئاست خشت دروست کراوەو درێژی گۆڕەکە، درێژی گۆڕێکی ئاساییە (١٨٠سم- ٢م) (گۆڕستانی چراغ- هەولێر)



(وێنە-٧) گۆڕێکی گۆڕستانی چراغ- هەولێر سەری کێلەکە بە پەڕۆی سەوز پێچراوەو ئاڵای سەوزی لەسەر چەقێنراوە.



(وێنە-٨) گۆڕی (خدیجە شێخ حەسەن) لە گۆڕستانی چراغ- هەولێر بە تەنیشتییەوە بۆڕییەك چەقێنراوەو كۆمەڵێ پەڕۆی سەوزی لێ كراوەتە دارەوە.

(دیارە ڕەنگی سەوز ڕەنگی سەید و پیاو چاكانە) و لەتەنیشت كێلەكەی لای سەری ئاڵایەك قوماشێكی سەوزی لێ لوول دراوە ئەوانەی كە دێنە زیارەتی پارچە پەڕۆیی لێدەكەنەوە وەكو متفەرك (وێنە-٩) گۆڕەكەش بەكاشی دروست كراوە، كێلەكەی لای سەرییەوە (١٤٠سم× ٤٠سم)ەو ناوەڕاستەكەی مەڕ مەڕ بووو سەرەوەكەی حلان و لەسەری نووسین كرابوو بەخەتی (دیوان) و (رقعە) (الشیخ محی الدین كركوك ابن الشیخ حسن گلزردی البرزنجی-(١٧٢٠م-١٧٨١م) استاذ الطریقة القادریة كان فرید دهره وحید عصره له مؤلفات في التفسیر الحدیث والفقه و التصوف والطب). لەسەر گۆڕەكەی زۆرجار بەردی خڕی سپی و لووس یاخود بەردی ڕەش بەڕێزەوە دانراوە وەكو نەریتێك گوایە ئەو بەردانە متفەڕكن چونكە ساتێك لەگەڵ ڕوحانییەتی ئەو گۆڕە یا تێكەڵ بوونە.





(وێنە-٩) مەرقەدی (شێخ محی الدین)ی كەركووك/ گۆڕستانی شێ محێ دین.

هەر لە گۆڕستانەكەی كەركووك گومەزێك بۆ (الامام محمد بن موسی الكاظم) دروست كراوە. ئەویش بەڕەنگی سەوز ڕەنگ كراوەو ئاڵایەكی سەوزی بەسەرەوەیە (گوایە ئەهلی بەیتە) و گۆڕەكەشی بە پارچە پەڕۆیی سەوز بان درابوو و هەڵنەنرابوو (وێنە-١٠)

لە گردی سەیوانی شاری سلێمانی چەندین گۆڕی تیادا بوو كە لە هەمووی دیارتر شوێنی (شێخ مارفی نۆدێ) یە ئەویش گۆمەزێكی بۆ كراوەو لەناو ژوورێكی بچووك گۆڕەكەی بە پەڕۆیی سەوز داپۆشراوەو لە سەر گۆڕەكەی كۆمەڵێ دانەی قورئان و گوڵ وێنە داندرابوو جگە لە بخوریش (وێنە-١١).

گۆڕی شێخە بچكۆڵێش لە گردی شەهیدانی شاری سلێمانی بە كۆمەڵێك پەڕۆ و بەرماڵ بان درابوو لەناو قەفەسێك نراوەو لە قەد قەفەسەكەكە بە سەوز ڕەنگ كراوەو نووسراوە (مەرقەدی شێخە بچكۆڵەی كوڕی حاجی كاك احمدی شێخ) (وێنەی ١٢-أ-ب).

لە گردی ناوەڕاستی سلێمانیش كە بەگۆڕستانی (كاسەو كەوچك) ناسراوە (گۆڕی عبدالكریم كاسەو كەوچك مەردۆخی) لێیە كە ئەمیش كێلەكانی سەوز كراون و تەنیشتەكانی و بنەكەی

بەڕەنگی سپی ڕەنگ کراوەو لەسەر کێلەکەی لای پێی بەرماڵێك بە کێلەکەوە بەستراوە (وێنە-١٣).

لە گۆڕستانی (شاخکی) لە دهۆکیش بە هەمان شێوە ئاڵاو قەفەس بەرچاو دەکەوتن، بەڵام گومەزم تیادا نەبینی تەنها گومەزی مزگەوتەکە نەبێ کە لە گۆڕستانەکە بوو. نموونەی ئەم گۆڕستانەش گۆڕی (الشهيد علي عبدالله الشيخ محمد سليم الاتروشي)یە کە بە بەردی مەڕمەڕی سەوز هەڵچنراوەو گۆڕێکی ئاساییە، بەڵام پانییەکەی زیاترە لە پانی گۆڕەکانی تر، زۆربەی گۆڕەکانی دهۆك بەرین تر بوون لە گۆڕی ناوچەکانی تر. جا هەر لەسەر ئەو گۆڕە ئاڵایەکی سەوزیش دانرابوو (وێنە-١٤).



وێنەی (-١٠) گۆمەزی (امام محمد) گۆڕستانی شێخ محی الدين- کەرکووك





(وێنەی -١١) وێنەی مەرقەدی شێخ مارفی نۆدی
لە دیویی دەرەوە گۆڕستانی گردی سەیوان- سلێمانی



(وێنەی -١٢-أ) گۆڕی شێخە بچکۆڵ گۆڕستانی شەهیدان- سلێمانی



(وێنەی -١٢-ب)
مەرقەدی شێخە بچکۆڵەی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ لەناو قەفەسێکی بەرزو فراوان گۆڕستانی شەهیدان- سلێمانی



(وێنە-١٣) (شێخ عبدالکریم- کاسەو کەوچك) گۆڕستانی



(گردی ناوەڕاست- کاسەوکەوچك- سەیوان) بەرماڵێك بە پەتێکی سەوزەوە بەسەر کێلەکەی لایی پێیەوە بەستراوەو گۆڕەکەی بە بەرد دروست کراوەو بەرزی کێلەکانی نزیکەی (١٦٠سم)ن.



(وێنە-١٤) گۆڕێکی گۆڕستانی (شاخکی) لە دهۆك بە بەردی مەڕ مەڕ دروست کراوە دیارە لە بنەماڵەیەکی شێخە لەبەر ئەوە ئاڵایەکی سەوز بەسەر گۆڕەکەیەتی یاخود لەبەر ئەوەی شەهیدە

گۆڕێکی تر هەر لە دهۆك گۆڕیی (محمد سعید صالح)ە، ئەم گۆڕە هەڵنەگرتراوەو بە نایلۆن بانیان دابوو، بەڵام دوو کێلی هەبوو بە گوڵنگی ڕەنگاو ڕەنگ کێلەکانیان ڕازاندبۆوەو ئاڵایەکی سپی لەلای سەری دانرابوو و ئاڵایەکی سووریش لەلای کێلەکەی خوارەوە دانرابوو لەگەڵ گۆڕێکی تر لەناو یەك قەفەس دا بوون. (وێنە-١٥) بە گشتی درێژایی هەموو گۆڕەکان لە نێوان (١٨٠سم- ١٩٠سم- ٢م) دایە، بەڵام ئەگەر گۆڕەکە هی منداڵ بێ ئەوە درێژییەکەی کەم تر دەبێ، جاری واش هەیە گۆڕمان بەرچاو دەکەوێ کە درێژاییەکەی ٢م ی تێ پەڕاندووە، ئەو گۆڕانەش یا مرۆڤەکە بەژن درێژ بووە یاخود گۆڕێکی گەورەی بۆ دروست کراوە، پانی گۆڕەکانیش لە نێوان (٤٠سم- ١م) دایە بەرزی کێلەکانیش بەگشتی مەترە یان مەترو نیوە بەپێی قالبی کێلەکەو دیکۆرەکەی. جا هەموو ئەم پێوانانە ناکرێ بە تەواوەتی حیسابی بۆ بکرێ چونکە لەگەڵ هەر گۆڕێکدا دەگۆڕی، بەڵام وەکو شتێکی ڕێژەیی پێوانەکان لەو دەوروبەردان. لە دهۆك گۆڕەکان زۆربەیان لا کێلی بۆ دروست نەکراوە (تەنیشتەکان) تەنها کێلی لای سەرەوەو خوارەوەی بۆ دانراوە یاخود بە چیمەنتۆ یا بلۆك دیوارێکی نزم یان بەرز لە

دەوری گۆڕەکە کراوەو کێلەکە لەسەر دیوارەکە دانراوەو ئەم دیوارەش بە چوار چێوەی گۆڕەکەدا دروست دەکرێ و ناوی پڕ دەکرێ لە خۆڵ و چەگل.

لە زۆربەی گۆڕستانەکانیش گۆڕمان بەرچاو دەکەوێ کە هەڵنەنراوەو تەنها کێلی بۆ دانـراوە لەبەر ئەوەی هەڵگرتنی گۆڕ لای ئیسلام جائیز نییە و هەندێ مەلا ڕێی پێ نـادەن، جـا لەبـەر ئەوە زۆرجار گۆڕەکە تەنها کێلی بـۆ دانـراوە (وێنـە-١٦) یـاخود تـەنها لـە دەوری گۆڕەکـە دیوارێکی نزم دەکرێ.

(وێنەی -١٥) گۆڕستانی شاخکی- دهۆك ئەم گۆڕە

دوو کێلی هەیە لە بەردی حەلان و ئاڵایەکی سپی و یەکی سووری بۆ دانراوە.



(وێنە-١٦) گۆڕستانی شاخکی- دهۆك ئەم گۆڕەش هەڵنەگرتراوە

تەنها دوو کێلی لە حەلان بۆ دروست کراوەو لەسەر کێلەکەی لای پێی گۆڕەکە سێ گۆڵ هەڵکەنراوە.



هەندێ گۆڕ هەیە لە گۆڕستانەکان نە کێلی بۆ دروست کراوەو نە گۆڕەکە هەڵگرتراوە، بەڵام تەنها بە بەرد داپۆشراوە یاخود دوو کاشی لە هەردوو سەری گۆڕەکە دانراوە. (وێنە-١٧-أ-ب) لە هەمانکاتدا گۆڕمان بەرچاو دەکەوێ کە بە کاشی داپۆشـراوە (وێنـە-١٨) وێنـەی گۆڕێکـە کێلەکانی بە حەلان بۆ دروست کراوەو ئەوی تری هەموو بەکاشی داپۆشراوە. هەروەها گۆڕی تر هەیە کە هەر بەکاشی دروست کراوە بۆ نموونە بڕوانە (وێنە-١٩-أ-ب).



(وێنە-١٧-أ) گۆڕێکە تەنها بە بەردی سپی داپۆشراوە بێ هیچ کێلێك یان نووسینێك (گۆڕستانی چراغ- هەولێر).



(وێنه-١٧-ب)

گۆڕستانی چراغ- هەولێر کێلی نییە تەنها دوو کاشی لەم سەرو ئەو سەری گۆڕەکە دانراوەو بە بەردی ڕەنگاو ڕەنگ داپۆشراوە.



(وێنه-١٨) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

ئەم گۆڕە کێلەکانی حەلانەو ئەوی تر کاشییە.





(وێنه-١٩-أ)

گردی شەهیدان- سلێمانی گۆڕی هونەرمەند (عثمان علی)



(وێنه-١٩-ب) گۆڕستانی شێخ محی الدین- کەرکووک

گۆڕی شاعیری گەورەی کورد ئەسیری

زۆرجار کێلی گۆڕەکان یاخود گۆڕەکە هەموو لەبەردی مەڕمەڕ دروست دەکرێ (وێنە-٢٠)، گۆڕێکە بە مەڕمەڕ دروست کراوەو لەتەنیشتی گۆڕەکە نەخشێکی ناسك کراوە بە گەڵای سەوز، دیارە ئەو گۆڕانەی کە بەبەردی مەڕمەڕو کاشی گرانبەها دروست کراون، گۆڕی ئەو کەسانەیە کە لەلایەن ئابوورییەوە باشن یاخود گۆڕی کەسێکی بەناو بانگە. ئەم جیاوازییەش لە نێوان جۆری بەردو شێوازی دروست کردن و ڕادەیی بایەخ دان بە دروستکردنی گۆڕەکە بۆتە هۆیی ئەوەی مۆرکێکی چینایەتی و جیاوازی کۆمەڵایەتی بە گۆڕەکانەوە دیاربێ.

کێلی گۆڕەکان زۆربەیان بە قاڵب دروست دەکرێ پانییەکەی لە نێوان (٤٠سم- ٦٠سم)ە و درێژییەکەشی بەپێی قالب و دیکۆرەکەیە جا سەری کێلەکە یان گۆشەدارە یاخود بازنەییە یان بە هەر شێوەیەکی تر زەخرەفەی پێ دروست کراوە، دیارە ئەمەش هەمووی دەوستێ لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری کەس و کاری مردووەکە. جا ئەوەی پیاو فەقیربێت ئەو گۆڕێکی ئاسایی بۆ دروست دەکرێ زۆر جاریش گۆڕەکەی هەڵناگرترێ وە ئەگەر هەڵگرترا ئەوە بە بەردێکی ئاسایی یان بە چیمەنتۆ کێل و گۆڕەکەی بۆ دروست دەکرێ.

ئێمە باسی گۆڕیی ئەو پیاوە چاکانەمان کرد کە لەبەر پیرۆزی و ڕێز گرتن لە پلەو پایەی ئاینیان گومەزیان بۆ دروست کراوە یان بینایی تایبەتیان بۆ دروست کراوە، بەڵام جگە لەوان زۆر لە گۆڕیی بەناوبانگە (سیاسییەکان و شەهیدەکان و زاناکان و شاعیر و نووسەرەکان) بینایی تایبەتیان بۆ دروست کراوەو بایەخێکی جیاواز بە گۆڕەکانیان دراوە. بۆ نموونە گۆڕی (حەمەی دوزی) کۆنە پێشمەرگە لە گۆڕستانی شەهیدان لە سلێمانی گومەزێکی بۆ کراوە لەسەر وێنەی (تاج) (وێنە-٢١) جا گوایە ئەم گومەزە داڵێکی بەسەرەوە بووە دایکی حەمە شەو لە خەوییدا کوڕەکەی دەبینێ و پێی دەڵێ دایە ئەو داڵە ئیسراحەتی لێ هەڵگرتووم هەموو شەوێك لە گۆشتەکەم لێدەکاتەوەو دەیخوا. جا گوایە دایکی حەمە دەچێت و داڵەکە لادەبات و گیانی کوڕەکەی ڕزگار دەکات. دیارە هەر گۆڕستانێکیش چەندین حەکایەتی تری لەو شێوەیەی هەیە.





(وێنەی-٢٠) گۆڕی ئەژی گۆران کوڕی گۆرانی شاعیر
گۆڕستانی کاسەو کەوچك/ سلێمانی



(وێنەی-٢١)
تاجەکەی (حەمەدی دوزی) کۆنە پێشمەرگە گۆڕستانی شەهیدان- سلێمانی

هەر لە گۆڕستانی سەیوان لە سلێمانی گۆڕیی (نوری صدیق شاویس) ی لێیە بۆ ئەمیش کۆشکێکی جوان  دروست کراوەو تەنها گۆڕەکەی خۆیی تیادایە (وێنە-٢٢) جگە لەوێش بنەماڵەی (رفیق حلمی) هەموویان بەیەکەوە لەناو خانوویەك دا نێژراون (وێنە-٢٣).

لە گۆڕستانی شێ محیالدین لە کەرکووکیش مۆنۆمێنتێك بۆ (دەشتی عەزیز تاڵەبانی) لە دەست تەکیەی تاڵەبانییەکانەوە دروست کراوە، مۆنۆمێنتەکە لەسەر شێوەی گۆمەتێکە ئاڵآیی کوردستانی پێکهێناوە و لەسەری ئاڵآیەکی کوردستان هەڵواسراوەو دەوری مۆنۆمێنێتەکە سیاج کراوە (وێنە-٢٤).

وەکو دیاردەیەکی زۆرباو کە لە ناو هەموو گۆڕستانەکان باو بوو، بوونی قەفەس بوو، قەفەس لەزۆر لە گۆڕستانەکان و بۆ زۆر گۆڕ دروست کراوە، بەڵام ئەم قەفەسانەش جیاوازیان هەیە قەفەس هەیە دوو گۆڕی تیادایە هەیە زیاتر هەروەها شێوازی دروست کردنەکەی دەگۆڕێ. (وێنە- ٢٥) وێنەی گۆڕێکی گۆڕستانی چراغە سەرەڕای ئەوەی بە کاشی هەڵنراوە کراوەتە ناو قەفەسێکیش، بەس نییە لەناو گۆڕدا زیندان بووە، گۆڕەکەشی لەناو قەفەسێکدا زیندان دەکەن. (وێنە-٢٦)  وێنەی قەفەسێکی ترە لە گردی سەیوانی سلێمانی کە بە شێوازێکی تایبەتی دروست کراوە. دیارە نموونەی قەفەس زۆر زۆرەو ناکرێ باسی هەر هەمووی بکەین، بەڵام دەکرێ بڵێین قەفەس دروست کردن بۆ گۆڕ وەکو نەریتێکی لێ هاتووەو زۆرتر بۆ شەهیدەکان دروست کراوە دیارە ئەمەش بۆ پاراستنی گۆڕەکەیە.



(وێنە-٢٢) گردی سەیوان- سلێمانی
کۆشکی (نوری صدیق شاویس) لە تەنیشتەوە.






(وێنە- ٢٣) گۆڕستانی کاسەو کەوچك- سلێمانی
خانووی تایبەتی بە بنەماڵەی مامۆستای نووسەر (رفیق حلمی)



(وێنە-٢٤) گۆڕستانی شێ محی الدین- کەرکووك مۆنۆمێنتی دەشتی تاڵەبانی پێشمەرگەی دێرین و شەهیدی ڕێگای ئازادی شاری کەرکووك.



(وێنە-٢٥) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنە- ٢٦)  گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی



زۆرجار لە گۆڕستاندا گۆڕمان بەرچاو دەکەوێ کە لە شێوە ئاساییەکەی لاداوە بە دیکۆرێکی جیاواز دروست کراوە ( وێنە-٢٧) گۆڕی (محمد سعيد فتاح)ە لە گردی سەیوان کە بەرزایی گۆڕەکەی نزیکەی (٣م) بوو، لە بەردی حەلان بە شێوەیەکی لاکێشەیی دوو نهۆم لەسەر یەکتری و لەسەریانەوە کێلەکە دروست کرابوو.

(وێنە -٢٨) یش گۆڕێکی گۆڕستانی چراغی هەولێرە کە بە شێوە صەندوق دروست کراوە یاخود تابووتێك لەبەردی مەڕمەڕو دوو کێلیشی بۆ دانراوە. دیارە لە گۆڕستاندا منداڵیش بێ بەش نییە، ئەوانیش گۆڕەکانیان بە چەندین شێوە بۆ دروست دەکرێ، جاروائش هەیە گۆڕەکانیان هەر هەڵناگرترێ چونکە منداڵەو پاش چەند ساڵێك دیار نامینێ، (وێنە - ٢٩) گۆڕی منداڵێکە کە بەچەمەنتۆ صەب کراوەو سەری گرتراوەو دەوری هەموو گیاو گۆڵ بوو.



(وێنەی- ٢٧) گردی سەیوان- سلێمانی گۆڕی (محمد سعيد فتاح)



(وێنە- ٢٨) گۆڕستانی چراغ- هەولێر گۆڕێکی داخراوە بە بەردی مەڕ مەڕ



(وێنە- ٢٩)
گۆڕستانی چراغ- هەولێر گۆڕی منداڵێك



دیارە نموونەی گۆڕ زۆر زۆرە، چونکە هەر کەس بەزەوقی خۆیی دروستی کردووە بۆ نموونە گۆڕە کۆنەکان کێلێکیان بۆ دروست دەکرا کە بەزەخرەفە دەڕازندرایەوەو بە خەتی جوان لەسەری دەنووسرا بڕوانە (وێنە-٣٠).

ئێستاش بە چەندین شێوە گۆرەکان دروست دەکەن و بە خەتی جۆراو جۆر لەسەری دەنووسرێ. (وێنە-٣١) گۆڕێکی دهۆکە کە بە بەردێکی جوان شورایەکی بۆ دروست کراوە لە دەوری گۆڕەکەو لەسەری کێلەکە دانراوەو ئەم گۆڕە گۆڕی شەهیدە، دیارە گۆڕی شەهید و پێشمەرگە بایەخێکی زیاتری پێ دراوە لەبەر ئەوە زۆرجار قەفەسی بۆ دروست دەکرێ یاخود بایەخ بە گۆڕەکەی دەدرێ بۆ نموونە وێنەی شەهیدەکە لەسەر کێلەکە دەکرێ بڕوانە (وێنە-٣٢).

چینێکی تر شاعیرەکانن کە ئەمانیش هەتا ڕادەیەك بایەخ بە گۆڕی هەندێکیان دراوەو مۆنۆمێنتی بۆ کراوە یان لەناو قەفەسێکدا دانراوە، وێنەی ئەو گۆڕی شاعیرانە لە پاشکۆی وێنەکاندا دەخەینە بەردەست. ئەگەرچی گۆڕی زۆر لە هونەرمەندان و شاعیر و نووسەرەکانی گەلەکەمان بێ بایەخ ماونەتەوە، ئەو گۆڕانەی بایەخیشی پێ دراوە لەلایەن



(وێنە- ٣٠) گۆڕستانی چراغ- هەولێر
کێلێکی کۆن کە بەخەتی (الجلی الثلث) لەسەری نووسراوە



(وێنە-٣١) گۆڕی شەهید (علی بداخ کمکی)
لە گۆڕستانی شاخکی- دهۆك



(وێنە-٣٢) گۆڕستانی شەهیدان - سلێمانی

لایەن خەڵکەوە دەشکێنرێ و ڕێزی لێ ناگوترێ ئەمەش کارێکی ناشیاوە کە بەداخەوە لەناو گۆڕستانەکاندا ئەنجام دەدرێ. دوا نموونە کە باسی بکەین گۆڕێکە کە کێلەکەکەی بە شێوەی مزگەوتێك دروست کراوەو بەرەنگی سەوزو سپی ڕەنگ کراوە، دیارە ئەمەش پەیوەندی بەلایەنی ئاینییەکەوە هەیە بڕوانە (وێنە- ٣٣).



دیارە لە گۆڕستاندا کۆمەڵێك شت دەبنین کە هەر یەکێکیان ڕەمزە بۆ شتێك ڕەنگ، ئاڵا، گوڵ... هتد، جگە لەوەش گۆڕمان بینی گومەزی بۆ کراوە یەکی تر وێنەی لەسەر کێشراوە یان بە قەفەس دەور دراوە یاخود بە مەڕ مەڕ دروست کراوە، داری بۆ چێنراوە، مۆنۆمێنتی بۆ دروست کراوەو..هتد. جا مەبەستمان لە چینایەتی ناو گۆڕستان ئەو جیاوازییە بوو کە لە نێوان گۆڕەکاندا هەیە. بەڵام هەموو ئەو شتانەی دەکرێ ئایە هیچ ماناو سوودێکی هەیە بۆ مردووەکە. ئایە ئەگەر قەفەسێکی زێر بۆ مردووەکەت دروست کەی ئەوە مردووەکە ئیسراحەت دەکا؟ دیارە مردوو هەر مردووەو ئەو شتانە هیچ لە دۆخەکەی ناگۆڕی، بەڵام سوودیی ئەو نەریتانە لەدڵدادنەوەی کەس و کاری مردووەکە دایە، چونکە بەو شێوەیە هەست دەکەن شتێکیان بۆ مردووەکەیان کردووەو بەرز ڕایان گرتووە، بەهەمان شێوە کە مۆنۆمێنت بۆ شاعیرو نووسەرو بە ناوبانگەکان دروست دەکرێ هەر وەکو پێزانینێکە بەو خزمەتەی ئەو کەسە کردوویەتی بۆ مرۆڤایەتی و ڕێز گرتنە لەگڵکۆکەی، ئەگەرچی باشترە ڕێز لە مرۆڤ بگرترێ و بایەخی بزانرێ لەژیانیدا نەك تەنها پاش مردن قەدری مرۆڤەکانی خۆمان بزانین و بۆیان بگرین.



(وێنە- ٣٣) گۆڕستانی شێخ محی الدین- کەرکووك

بە هەر حاڵ ئەوەی لەلای ئێمە گرنگە کاتێ دەچینە ناو گۆڕستانەوە بەهۆی ئەو نووسین و شێوازانەی کە بۆ گۆڕەکان بەکارهاتووە دەتوانین لایەنێك لە جۆری بیرکردنەوەی مرۆڤ و عەقڵییەت و داب و نەریتی میللەتەکەمان لا ڕوون ببێتەوەو لایەنێك لە مێژوویی ئەو گەلە دەخوێنینەوە هەروەها هەست بە جیاوازی ڕادەی ڕۆشنبیری دەکەین لە نێوان شارەکان و نەتەوەو میللەتەکان.

## ڕەمز لەسەر کێلی گۆڕەکان:

گۆڕستان ئەو تابلۆیەیە کە چەندین هونەری تیا بەکارهێنراوە تا وێنەی شاری مردووەکان دروست بووە.

تابلۆیەك پڕ لە وێنە، وێنەیەك پڕ لە ڕەمز، ڕەمزێك چەندین واتای لە خۆگرتووە، هەر ڕەمزێك ئاماژەیە بۆ مەبەستێك و ئەگەر چەند ڕەمزێکیش پێکەوە بن وێنەیەك دەخوێننەوە باسی ڕووداوێك دەکات، ڕووداوێکی کۆن تایبەت بە کەسێکی مردوو، دیاردەیەك لە قوڵایی ژیانێکی بەسەر چووەوە لە چوارچێوەی کێلەکاندا بەرجەستە کراوە.

لەم شار و کۆمەڵگایانەی ئێمەدا گرنگی بە گۆڕستان دەدرێ جا چ بەشێوازی دروست کردنی گۆڕەکە بێ یان بەو نووسین و وێنەو ڕەمزانەی لەسەر گۆڕەکە تۆمار دەکرێ یاخود بەو داب و نەریتانەی کە بەکەش و هەوایی گۆڕستانەوە دەیلکێنن.

بە گشتی سەرچاوەی ئەو بایەخدانە پەیوەندی بە شێوازی بیرکردنەوەی کۆمەڵگاکانەوە هەیەو چۆنیەتی تێگەیشتنیان بۆ دیاردەی مردن جا بەپێی ئەو تێگەیشتنە هەڵسوکەوت لەگەڵ دیاردەکە دەکەن.

یەکێك لەو دیاردانەی لە ناو گۆڕستان بەرچاو دەکەوێ بوونی ڕەمزە، هەموو شتێك لەناو گۆڕستان لە شوێن خۆیدا ڕەمزە تەنانەت گۆڕەکەش ڕەمزی مردنە، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەو ڕەمزانەیە کەلەسەر کێل و گۆڕەکە وێنە کراوە یاخود هەڵکۆڵراوە.

تۆمارکردنی وێنەو ڕەمز لەسەر کێلی گۆڕەکان کارێك نییە ئەمڕۆ خەڵك ئەنجامی بدات، بەڵکو لە کۆنەوە ئەم دیاردەیە هەبووە، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی ڕەمز ڕێگایەکە بۆ دەربڕین و زۆرجار لە بری نووسین بەکارهێنراوە بۆ ئاماژە دان بە زانیارییەك یا گەیاندنی واتایەك.

جگە لەوەی لەسەرەتادا هەموو دیاردەکانی جیهان بەلایەن مرۆڤەوە بریتی بووە لە ڕەمز سەرەڕای ئەو هەموو ڕەمزە ئاینیانەی بەدرێژایی ڕۆژگار پەیدا بووەو هەر لەبەر ئەوەیە دەبینین زۆر شتە کۆن و شوێنەوارییەکان وێنەو ڕەمزی لەسەر هەڵکۆڵراوە نەك تەنها لەسەر گۆڕەکان بەڵکو لەسەر دەرگاو دیواری پەرستگاو شتومەکە کۆن و ئاسارییەکانیش. ئاشکرایە لەناو هەر میللەتێك و ئایینێك کۆمەڵە ڕەمزێك هەیە کە بەستراوەتەوە بە ڕووداوێك یان بە واتایەك و ئەگەر بمانەوێ لەرەمزێکی کۆن بگەین دەبێ ئەو ڕەمزە بگەڕێنینەوە ناو سەردەم و مێژووەکەی خۆی و لەوێ دەست بەکاری بکەینەوە تا هەموو لایەن و پێچەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و



بیروباوەڕی ئەو سەردەمەمان لان ڕوون دەبێتەوە ئەمەش دەمانگەیەنێ بە مەبەستەکەی خۆمان کە زانینی ئەو واتایانەیە کە ڕەمزەکان لە خۆیان گرتووە.

کاری شیکردنەوەی ڕەمزەکانی سەر کێل و هەموو شوێنەوارەکانی تر کارێکی سووك و ئاسان نییە، چونکە پێویستی بە وردەکارییە لەلایەن کەسانێکی پسپۆر لە بواری شوێنەوارو مێژوو مێژوویی داب و نەریتی گەلان و شارستانییەتەکان... هتد. لەبەر ئەوە پێویستە ئەم کارانە دەزگای شوێنەواری بیکات کە کۆمەڵێك کارمەندی بواری جیا جیا کاری تیا بکات تا ئەو شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی کە دەکرێ بە هەماهەنگی هەموو لایەك بێ بۆ ئەوەی دوا بڕیار بەرچاوکردنی هەموو وردەکارییەکان بێ، بەڵام لەبەر ئەوەی لە کوردستان کارەکان بە گرووپ ناکرێ و زۆربەی تاکە کەسییە ڕاڕایی و جیاوازی بۆچوون زۆرە لە نێوان ئەنجامەکان.

لەم باسەشدا هەوڵدەدەین باسێکی ئەو ڕەمزانە بکەین کە لەسەر کێلی گۆڕەکان بەرچاومان کەوت لە سنووری کارەکەمان. ئەگەرچی دەکەوینە هەمان هەڵەوە، بەڵام خۆ ئەگەر دەرگایەکمان پێ نەکرێتەوە با هیچ نەبێ لە پەنجەرەیەکەوە سەرنجێك بدەین، سەرەتا باسی هەندێك لەو نموونانە دەکەین کە لە کوردستاندا هەیە، بەپێی چەند وتارێك کە لەم بارەوە بڵاو کراوەتەوە، کە تیایدا ئاماژە بە شوێن و شیکردنەوەی گۆڕو ڕەمزەکان دراوە، ئەو کێلە هونەریانەی کە ڕەمزو وێنەیان لەسەر تۆمارکراوە لە زۆر جێگا لە کوردستاندا بەرچاو دەکەوێ کە بۆ سەردەمی جیا جیا دەگەڕێتەوە و هەر چەند کات بەسەر ئەم ڕەمزانەدا تێ بپەڕێ گرنگی لە ڕووی مێژووییەوە زیاد دەکات. تێگەیشتن لەم ڕەمزانەش پەیوەستە بە دەوروبەرو ئەو سەردەمەی کە تیایدا تۆمارکراوە خۆ دەکرێ هیچ واتایەك لە پشت ڕەمزەکانەوەش نەبێ و تەنها بۆ جوانکاری بێ، بەهەر حاڵ یەکێك لە گۆڕستانەکانی باشووری کوردستان کە ئەم کێلە هونەریانەی تیادا دۆزراوەتەوە گۆڕستانی (دوین)ی هەولێرە کە دەکەوێتە نێو (دوین)و نزیکی شەست گۆڕی لێ لە نێو کەڵەکە بەردێکی تایبەتی دان و دەوری (١٨- ١٩) گۆڕی ئەم گۆڕستانە نەخش دارن، و نەخشی ئەندازەیی و سێگۆشەو پەقلاوەیی و نیوە پەقلاوەیی تێکپەڕیووە (متداخل) و لاکێشەو بازنەو... هتد. بە سەرەوەیە، هەروەها وێنەی چەندین شت لەسەر بەشێکی ئەم کێلە بەردانە هەڵکۆڵراوە، وەکو وێنەی خۆرو مانگ و شمشێرو خەنجەرو کیفی خەنجەر کە ڕەمزن بۆ مەبەستێك. جگە لەوەش وێنەی تفەنگ و فیشکدان و کوولەکە ڕۆنی چەوورکردنی شیر و خەنجەرو وێنەی گۆچان و حەیوانە کێوی... هتد. لەسەر کێلەکان تۆمار

کراوەو ئەو بەردەش کە کێلەکەی لێ دروست کراوە بەردی کلسی سپییەو مێژووی بەسەرەوە نەبووە[٦٤].

شوێنەوار ناس (عبدالرقیب یوسف) زۆربەی نەخشی سەر ئەو کێلانەی لێکداوەتەوە کە لە (دوین) بەرچاوی کەوتووە.

بەگشتی زۆرینەی ئەو کێلانەی کە خەنجەرو چەکوشی شەکرشکێن و شمشێرو دەمانچەی لەسەرە بەنیشانەی میرخاسی و بەوەی مردووەکە خاوەن دیوەخان و پیاوێکی گەورەو بەناو بانگ بووە لێکداوەتەوە. وێنەی خۆرو مانگیش پەیوەندی بە بیرو باوەڕی کەسەکان هەبووە لەمەڕ ئاین و گەردوون. جگە لەوانەش گوڕ هەبووە وێنەی گۆپاڵی بەسەرەوە بووە لەگەڵ کۆمەڵێك هێمای تر شمێشێرو خەنجەرو داری ڕاست... هتد. دیارە بەڕای ئەو گۆپاڵ نیشانەی شوانی و کۆچەرایەتی نییە، بەڵکو نیشانەی حوکم و فەرمانڕەوایی و گەورەیی دەبەخشێت. هەر بەسەر ئەو گۆڕانەوە هێمایەك کراوە کە زیاتر بە نیشانەی (+) کۆ دەچێ، مرۆڤی کۆن وەکو نیشانەی ژیان و خۆرو هەر چوار لایەکە (الجهات الاربعة) بەکاری هێناوە، ئارییەکانیش کردوویانەتە نیشانەی خوا — میترا- میهر لە هەمانکاتیشدا وێنەی ئەستێرەش دەبەخشێ.

لەسەر کێلێکی دیکەی ئەو گۆڕستانە وێنەی حەیوانە کێوی هەڵکۆڵراوە کە بەپێی باریکی دەم و چاوی بە مامزی داناوە، و وێنەی خەنجەرێکی دەم تیژ لەلای ڕاستی هەیە نووکە تیژەکەی گەیشتۆتە بەر لاقی دواوەی و شێوەی خەنجەرەکە لە خەنجەری کوردی مەیلەو چەماوە نەبووە، بەڵکو دەمەکەی ڕاست و ڕاستە جۆری یەمەنی بووە، جا کاتێ چەند ڕەمزێك لەسەر کێلێك تۆمار کرابن بە یەکەوە دەکرێ وەکو وێنەیەك لێکبدرێتەوە. مامۆستا (عبدالرقیب) لێکداوەتەوەو پێی وایە مامزەکە نیشانەی ئەوەیە کە خاوەن گۆڕەکە کچ بووە یا ژنێکێکی لاوی شۆخ و شەنگ بووەو کوژراوە یا کچێك کە جێی چاو تێبڕینی زۆر کەس بووەو جوانە مەرگ بووە. (عبدالرقیب یوسف) لە وتارەکەیدا کێل بە کێل باسی ئەو گۆڕانە دەکات و ڕەمزەکانی لێکداوەتەوە، جگە لەوەش باسی هەندێك کێلی هونەری دەکات لە گۆڕستانی (شەمس و قەمەر) ی دێی سورداش کە هی سەردەمی بابانییەکان بووەو وێنەی خۆری پرشنگدار بە پێشە

(٦٤) صلاح الدين ئەيوبی خەڵکی دوینی ئەرمەنستانە نەك دوینی هەولێر، عبدالرقیب یوسف، گ. هەزار مێرد، ژ١١، سلێمانی،؟



سەری کێلەکانەوە بووەو وێنەی مانگی چواردەش لە دامێنیانەوەو هەر وەکو ئەوانەی (دوین) (پەپکە) قرصێکی سادەن، بەڵام بازنە یان خەرمانەیان لەدەور نییە[٦٥].

خوێندنەوەیەکی تر کە بەهەمان شێوە بۆ کێلێك لە کێلەکانی دوین کراوە، خوێندنەوەکەی (عبدالخالق سەرسام)ە، کە تیایدا وێنەی ڕۆژ بەمانای زەرد لە قەڵەم دەدا (زەرداری- زراری) و خەنجەرو شیریش بەهێزو دەسەڵاتی کورد ناو دەباو وێنەی دوو هێڵی یەکتر بڕ لەسەرەوەو خوارەوەی کێلەکە کراوە بە وێنەی خاچێکی ڕێك و لا نیوە هەڵواسراو داناوە لەڕێی ئەو هەموو شتانەوە دەگاتە ئەوەی بڵێ گۆڕەکە گۆڕی سەرکردەیەکی زراری بووەو زرارییەکان سەرکردەی کوردو موسڵمان بوونە، و لەدرێژایی قسەکانیدا باسی کێلێکی تر دەکا کە وێنەی گۆپاڵی بەسەرەوەیە ئەم بە پێچەوانەی (عبدالرقیب یوسف)وە دەڵێ: گۆپاڵ سیمبۆلی ڕەواندایەتییەو واتای کۆچەرایەتی دەگەیێنێ و خەنجەرو شیریش بەهێزو سەرکردایەتی لەقەڵەم دەدا[٦٦].

لێرەدا لەبەر دەمی دوو ڕایی جیاوازین سەبارەت بەشیکردنەوەی یەك ڕەمز کە (گۆپاڵ)ە، (عبدالخالق سەرسام) بە نیشانەی ڕەواندویەتی دادەنێ و (عبدالرقیب یوسف)یش بەنیشانەی فەرمانڕەوایی.

بە بۆچوونی من گۆپاڵ نیشانەیە بۆ پیری جا بۆ مردووەکە پیرێك نەبووبێ و گۆچانی بەکارهێنابێ و لەسەر گۆڕەکەی وێنەکرابێ لەگەڵ هەموو ئەو شیرو خەنجەرو...هتد. کە لەڕۆژانەی ژیانیدا بەکارهێناوە یاخود خاوەنی بووە، جا سوار چاك بووبێ یا خاوەن دەسەڵات یاخود لەژیانی لاوێتیدا شەرکەرێکی باش بووبێت و بەگشتی ئەگەر سوار چاك و دەسەڵاتدار و ئاغا نەبێ ئەو شیرو خەنجەرو شتانەی بۆ چییە؟

لە بابل و ئاشووری کۆنداو لە وڵاتی میسۆپۆتامیا بەگشتی زۆر گۆڕ دۆزراوەتەوە کە شتومەکی مردووەکەی تیادا بووە، ئەو شتانەی کە لەڕۆژانەی ژیانیدا بەکارهێناوە لەگەڵ سامانەکەی خراونەتە ناو گۆڕ لەگەڵ مردۆکەداو لەوەش کۆنتر گۆڕی هەندێك ڕاوچی بووە کە کەرەسەی ڕاوکەیان لەگەڵیاندا نێژراوە، بەڵام لەگەڵ هاتنی ئیسلام ئەم نەریتە ڕەتکرایەوە چونکە ناکرێ هیچ شتێك لەگەڵ مردووەکەدا بنێژرێ حەرامە.

(٦٥) سەرچاوەی پێشوو.

(٦٦) گۆڕیی پیر مەڕوان و نهێنییەکانی، عبدالخالق سەرسام، گ؛ هەولێر، ژ١٣، هەولێر، ٢٠٠١. ل ؟.

جا پێم وایە لەبەر ئەوەیە وێنەیی شتەکان لەسەر گۆڕەکە تۆمارکراوە وەکو پاش ماوەیەکی ئەو نەریتە لە بری هەڵگرتنی کەرەسەکان لەگەڵ مردووەکە لەناو گۆڕەکەی لەسەر کێلەکەیی وێنە دەکرێ و ئاماژەی پێ دەکەن. دیارە ئەو گۆڕانەی (دوین) و زۆربەی شوێنەوارەکانی تری کوردستانیش کە ئەو وێنانەیان لەسەر کراوە بۆ سەردەمی ئیسلام دەگەڕێتەوە لەبەر ئەوە پێم وایە ئەو وێنانەی لەسەر گۆڕەکان وێنە کراون زۆربەی دەلالەتە بۆ پایەی کۆمەڵایەتی و بۆ ئەو کەرەسانەی کە مردووەکە لە ژیانیدا بەکاری هێناوەو خاوەنی بووە.

وێنەی خۆریش لەسەر کێلەکان هەر وەکو سیمبۆلێکی ئایینی پیرۆزە لەناو خەڵکی ماوەتەوەو خۆیی پاشماوەی ئایینی زەردەشتی و میترایییە، بەڵام پاش هاتنی ئیسلام و بزربوونی ئەم ئاینانەش ڕەگ و ڕیشەی نەریتەکان لەناو خەڵکی تا ماوەیەکی زۆر ماوەتەوەو تا ئێستاش ئەگەر بگەڕێین بە دوایدا دەیدۆزینەوە.

نموونەیەکی تر لە کێلە هونەرییەکانی کوردستان کێلەکانی (قەرو گوڵەزەر)*ە کە وێنەی شمشێرو خەنجەرو کێردی بەر خەنجەر و گوڵ و نەخشی ئەندازەییان بە سەرەوەیەو بەهونەرێکی کوردی ڕەسەن دەژمێردێن، کێلەکانیان لە بەردی سپی دروستکراون کە جۆرە مەڕمەڕێکە گوایە لە شاخی قەندیلەوە هێنراوە، هەروەها لە گۆڕستانی (زێر باوان)ی خوارووی دێی (لێوژێ)ی خوارووی قەندیل هەندێك کێلی هونەری هەیە، بە هەمان شێوە دروست کراوەو هەمان نەخشی هونەری لەسەر کراوە وەکو گۆڕەکانی (قەرو گوڵە زەر).

* قەرو گوڵەزەر بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لە وتارەکەی مامۆستا عبدالرقیب وەرمگرتووە، دوو دڵدارو دڵخواسی کۆنی وەکو (مەم و زین) و (خەج و سیامەند) بوونە. گۆڕەکانیان بۆ یەکەم جار بەسەر بەری باشووری چەمی دوڵە ڕەقەی بەرامبەر دێی پڵنگانەوە بووە لە نێوان سێ دۆڵ و چوار ڕێگاو جێی تێکەڵ بوونی دوو چەم لەسەر ڕێگای گشتی خێڵاتدا بووە. زنجیرە چیا بەرزەکانی (ماکۆك و کارۆخ و بێرمکە)ی لێوە دیاربوونە، بەڵام پاشان بەڕێوەبەرایەتی ڕێگاو بانی سلێمانی ئەم گۆڕانە تێکدەدات (١٩٧٦- ١٩٧٧)، وساڵی (١٩٨٤) (عبدالرقیب یوسف) کێلەکانیان دەدۆزێتەوە ئێسك و پروسکی قەرو گوڵەزەر کە (مەلا عوسمان) ناوێك هەڵیگرتبوو دەیهێنێت و لە دووری (١٠٠م) لە جێگاکەی پێشووتریانەوە گۆڕی نوێیان بۆ دروست دەکات و کێلەکانی خۆیان پاش چاکردنەوە بۆ دادەنێتەوە.



لە گۆڕستانی (ڕەزان)یش لە گوندی (ناو زینان) لە باشووری خۆر ئاوایی (پڵنگان) کێل هەن کە لەهەمان بەرد دروست کراون و هەمان تەرزو هونەریان هەیەو مێژوویی ئەم کێلانەش لەوەیە بۆ سەردەمی (قەرو گوڵەز) بگەڕێتەوە، واتە چوارسەد ساڵ بەر لە ئێستا[٦٧].

لە میانی گەڕانی ئێمە لەناو گۆڕستانەکاندا چەند کێلێکی نەخشدار کەوتە بەرچاومان و بە پێویستم زانی شتێك لەبارەیانەوە بنووسم وێنەکانیان بگرم بەتایبەتی ئەو گۆڕانەی کە لەگۆڕستانی (چراغ)ی هەولێر بوون، چونکە مێژووەکەیان لەوانی تر کۆنتربوو.

بۆ شیکردنەوەی ڕەمزەکان و زانینی مەبەستەکانی و مێژووەکانیان بە پێویستم زانی وێنەی کێلەکان بە پسپۆری بواری شوێنەوار و مێژوو پیشان بدەم تا لەو بارەوە هەندێك زانیاریمان بۆ ڕوونکاتەوەو پێمانی بگەێنێ. بۆ ئەم مەبەستەش سەردانی سلێمانیمان کردوو چوینە لای (مامۆستا عبدالرقیب یوسف) شوێنەوارناس، هەروەها وێنەکانمان بە مامۆستا (دڵشاد) پیشاندا قوتابی ماستەر لەبەشی ئاساری کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین کە زانیاری لەم بابەتەدا هەبوو، ئەوانیش لە بارەیی وێنەو گۆڕستانەکانەوە ڕوون کردنەوەیاندا و زانیاریان پێ وتین.

سەرەتا لە بارەی گۆڕستانی (شێخەڵلا) وە مامۆستا (عبدالرقیب) وتی: (قەبرستانی شێخەڵلا قەبرستانێکی زۆر کۆنە، من زۆر عەریزەم دا بۆ نیقابەی هونەرمەندان بۆ ئەوەی بچن ئەو کێلانە تصویر بکەن، بەڵام کەس قیمەتی نەزانی).

زۆربەی ئەو گۆڕانەی کە لەگۆڕستانی (چراغ) دا هەیە لە شێخەڵلای شاری هەولێر لەبەردی حەلان و بەردی ئاسایی و چیمەنتۆ دروست کراوە، بەڵام ژمارەیەکی شکاوە. مێژووی ئەم کێلانەش بۆ سەدەی بیستەم و نۆزدەهەم دەگەڕێتەوەو دەکرێ گۆڕی تیادا بێ کە مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم.

یەکێك لەو ڕەمزانەی کە لەو گۆڕستانەدا بەرچاومان کەوت وێنەی سەرەگا بوو کە لەسەر چەندین کێلدا دووبارە دەبۆوە. لە بارەی وێنەی سەرەگا لەسەر کێلەکان (مامۆستا عبدالرقیب) دەڵێ: (بوونی سەرەگا لەسەر کێلەکان بۆ تأریخێکی زۆر کۆن دەگەڕێتەوە بە نسبەت کوردستانەوە نزیکەی ٢٠٠٠ ساڵ لەمەو پێش، ئەم سەرەگایەش نیشانەی میترایە (الاهی ئاسمان)، ئایینی میترایی لە کوردستاندا پێش زەردەشتی بووەو زۆر بڵاوبووە لە سەران سەری کوردستانی باشوور، تەبیعی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتیش هەبووە، بەڵام دائیرە ئاسارییەکانی

(٦٧ ) قەرو گوڵەزەر، عبدالرقیب یوسف، رامان، ژ٧٣، هەولێر، ٢٠٠٣.

ئیران ئاساری ئایینی میترایییان کەشف نەکردووە. هەروەها یەزیدییەکانیش میترایین لەبەر ئەوە سەرەگا موقەدەس بووە لایان، و لە زۆر شوێن لە کوردستان هەیەو بۆ خۆم وێنەم گرتوون لەسەر پردو ئەشکەوت و بەردو شتی وا و لەکوردستان زۆرە. بەو تەقلیدە پیرۆزەوە کەوتۆتە ناو تأریخی ئیسلامییەوەو لەسەر کێلی قەبری ئیسلامییەکانیش هەبووە، ئەو رەسمانەی لەسەر کێلی قەبرستانی شێخەڵلادا هەیە مێژووەکەی هی سەدەی نۆزدەهەم و هەژدەهەمەو لەو باوەڕە نیم کۆنتر بێت، بەڵام قەبرستانێکی بە قیمەتەو جێگای بایەخە).

وێنەی سەرەگا لەسەر کێلی گۆڕەکانی گۆڕستانی چراغ زۆرە، بەتایبەتی ئەو بەشەی کە دەکەوێتە دەست بازاڕەکەی شێخەڵلاوە. (وێنە- ٣٤) کێلی گۆڕێکە لەلای سەرەوەی کێلەکە شێوەیەکی بازنەیی نارێك هەیەو لە ناوەڕاستی کێلەکەش وێنەی سەرەگایەکە هەڵکۆڵراوەو لە تەنیشتەکانی ڕاست و چەپ وێنەی دوو بازنەی لەناو یەك کراوەو دوو شێوەی نارێکیش هەن بەرامبەر بەیەك لەلای ڕاست و چەپ، جا وێنەکەی سەرەوەی کێلەکە دەکرێ بڵێین نیشانەیە بۆ خۆر یاخود زیاتر بە خۆر دەچێ و سەرەگایەکەش هەر سەرەگایە، بەڵام ئەو شێوانەی کە بەبازنە دەچن و لەلای خوارەوەی کێلەکە وێنە کراون جێگای سەرنجن چونکە بازنەیەکی تەواو نین و لەسەر زۆربەی گۆڕەکاندا هەبوو، سەرەتا وێنەکەم بە مار چواند مارێك لوولی خواردبێت، بەڵام مار درێژە ئەمەش کورتەو ئەوەی هانیدام بۆ ئەوەی ئەم وێنانە بە مار بچوێنم نەریتێکی ئایینی میترایییە شتێکی سەرنج ڕاکێشە ئەویش کوشتنی قوربانییە، (قوربانییەك (گایەك) دەکوژن تاکو خوێنەکەی برژێتە سەر زەوی و ببێتە هۆی ساغی و ژیانەوەی سروشت و پەیدابوونی جۆرەها گیاندارو گیاو هەر ساڵ میترا گایەك دەکوژێت تاکو خوێنەکەی جارێکی تر سروشت گەش بکاتەوە، و دەمی کوشتنی گایەکە مارێك و دووپشکێك و سەگێك نزیکی خوێنەکە دەکەنەوە وێنەی ئەم شتانە لەسەر شوێنەوارەکاندا دۆزراوەتەوە)[٦٨].

(٦٨) میترا پەرێسی مێژوو بیروباوەڕ، عەلی تەتەر نێروەیی، گ. لالش، ژ١٣، هەولێر، ٢٠٠٠.





(وێنە- ٣٤) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

جا دەکرێ بڵێین لەبەر ئەوەی گا پیرۆز بووەو خوێنەکەی بۆتە هۆی ژیانەوەی سروشت وێنەکەی لەسەر کێلەکان نەخشێنراوە، بەڵکو بۆ جارێکی تر ژیان ببخێشتەوە بە مردۆکە. یاخود هەر لەبەر پیرۆزی خواوەندی میترایەکە (گا) ڕەمزێکە پەیوەستە بە میتراوە لەبەر ئەوە وێنەکەی لەسەر کێلەکان دەکرێ و لەبارەیی زاراوەیی (میترا)* و پیرۆزەکەی باسی زۆر کراوە، چونکە میترا خواوەندێك بووە دەسەڵاتی زۆری پێ بەخشراوەو لەبارەیەوە وتراوە (میترا سەروەری لەخشتە نەبراو خاوەنی دەهەزار چاو) ئەو کەسەی کە هەموو زەویی مەنزڵگای ئەوە، ئەو کەسەیە کەس ناتوانێت لە خشتی ببات، میترا بەرەکەت بەجیهان دەبەخشێت لەڕێگای

* (میترا) وەکو چۆن لە گۆڤاری لالش ژ. (١٣)ی ساڵی ٢٠٠٠ لە وتارێکی (عەلی تەتەر نێروی) (میترا پەرێسی) دا هاتووە، (خواوەندی میترا ناڤێ وی دنڤێسنێن مێخێن سەدێ پازدێ درێکەفتنا دناڤبەرا میتانی و هیتییاندا بە ڕەنگی میترا (Mitra)و د ئاڤێستاییدا بە ڕەنگێ (میثە ر- Mithar)و زمانی پەهلەویدا (میهر- Mihir) و د فارسی یا نوێدا بـ ناڤێ (مێهر- Mehir) هاتییە بکارئێنان).

ئاوەکان لەبزاوتدان و گیاکان دەڕوێنی، میترا سەروەت و سامانی مادیی وەکو مێگەل و دەسەڵات و فەرزەندو ژیان دەبەخشێت...)[٦٩].

(وێنە-٣٥)ش کێلێکە هەمان وێنەی کێلی ژمارە (٣٤)ی لەسەر کراوە سەرەگاو هەموو شتەکانی تر، بەڵام مامۆستا (دڵشاد) پێی وا نییە کە ئەم وێنانە سەرەگا بن و زیاتر ئەگەری ئەوە دادەنێت کە پشتدێنی ئافرەت بێ لەگەڵ ملوانکە، هەروەها شێوە بازنەییەکەی لای سەرەوەی گۆڕەکە بە ئاماژەیەك دادەنێ بۆ مەبەستێکی تر، چونکە بازنەکە بە هێڵێکی ڕاست وێنە نەکراوە جا بۆ ژمارەی دانەکانی بازنەکە ئەو پێی وایە مەبەستێکی لەدواوە بێ ژمارەیی مانگەکانی ساڵ بێت یاخود هەر شتێکی تر، بەڵام وێنەکان زیاتر بە سەرەگا دەچن و پێموا نییە شتی تر بن.



(وێنە- ٣٥) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

(٦٩ ) میترا- (میهر)، و. لە فارسییەوە دلێر میرزا، گ. هەزار مێرد، ژ٢٠، سلێمانی، ٢٠٠٢.



لە (وێنە-٣٦-٣٧)تیش بە هەمان شێوە کێلەکان وێنەی سەرەگایان لەسەر هەڵکۆڵراوە لەسەر یەکێکیان شێوەی دوو بازنەی لەناویەك وێنە کراوە یەکێکیان بچووك و ئەوی تر گەورە ئەمەیان بازنەیەکی تەواوەو دەکرێ تەعبیر بێ لە مانگ و خەرمانەکەی دەوری یاخود چەقی گەردوون کە خۆرەو وشتەکان بەدەوری دەخولێنەوە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە بەردەوام دوودانە وێنە کراوە لەسەر کێلەکان لەبەر ئەوە دەشێ مەبەستێکی تری لەدواوە بێ دوور لەو مەبەستانی ئێمە باسمان کرد. و شایەنی باسە ئەو گۆڕانەی کە باس کران هیچی ناوی خاوەنەکەی بەسەرەوە دیار نەبوو.

کێلی پێنجەم (وێنە-٣٨) وێنەی خۆرێك بەلای سەرەوەی کێلەکەوەیە یاخود مانگێك و خەرمانەکەی دەوریی و لەژێرییەوە وێنەی قۆچی گایەکی چەماوە کراوەو لەژێریشییەوە دوو بازنەی داخراو لەناو یەك و چەند شێوەیەکی نارێك و دوو هێمای تریش کراوە لە شێوەیی بازنەیی کراوەیەو دوو سەری هەیە (مامۆستا دڵشاد) دەڵێ نیشانەی (ئۆمێگا)* یە و ئۆمێگا ڕەمزێکی ئایینی و پیرۆز بووە، و دەکرێ ئێمە لێکدانەوەیەکی تر بکەین بۆ ئەم ڕەمزانە، بازنەکان بەبازنەی دەستی ئافرەت دابنەین و بازنە کراوەییەکەش بە خرخاڵی پێی ئافرەت و وێنەی خۆریی سەروەی کێلەکەش هەر بۆ پیرۆزی خۆر دەگەڕێتەوە لەناو ئایینی زەردەشتی و میترایی ئەوە ئەگەربێت وێنەکە وێنەی خۆر بێت.

* ئۆمێگا وەکو چۆن مامۆستا (دڵشاد) باسی دەکا، گوایە ڕەمزێکی ئایینییەو لە فەنی یاخود هونەری (کاشی)یەکان ١٥٩٥- ١١٥٧پ.ز باو بووەو لە فەنی یۆنانیشدا هەمان ڕەمزیی ئۆمێگا هەیە وەکو ڕەمزێکی دینی.



(وێنە-٣٦) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنە- ٣٧) گۆڕستانی چراغ- هەولێر





(وێنە- ٣٨) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

(وێنە-٣٩) کێلی گۆڕێکە لەبەردی حلان دروست کراوە لەبەر سەرەوەی کێلەکە لەناو سێگۆشەیەك نووسراوە (یا غفار)و لە ژێرییەوە وێنەی دوو بازنەی تەواو و دووبازنەی کراوە هەڵکۆڵراوە بەڕەنگی ڕەش ڕەنگ کراوە، دەکرێ شێوەی بازنە کراوەکان بەنیشانەی ئۆمێگادا بنەین، بەڵام ئەی بازنەکانی تر چین؟ جا بە بۆچوونێکی تر دەکرێ بڵێین بازنەکان بازنەی دەستی ئافرەتەو ئەوەی تریش خڕخاڵەکانی پێیەتی و لەژێر ئەوانەش وێنەیەك کراوە بە ملوانکە دەچێ و لە تەنیشتەوە مەقەستێك کە دەمەکەی کراوەتەوەو بەرەو لای ملوانکە کە ئاڕاستە کراوە وێنەیی کراوە. لە بارەی وێنەی مەقەسەوە مامۆستا (عبدالرقیب) دەڵێ: (مەقەس موقەدەس بووەو لەناو ئاساریی یەزیدییەکاندا هەیە، لەسەر مەرقەدی شێخ مەند لە (عین سفن)دا لەبەر مەرقەدی شێخ دایە، و مەقەس سیفەتێکی دینی هەیە، چونکە ئامێری بڕینی قژە، شێخ مەندیش خۆی شێخی بسکێ بووە، منداڵ کە دەبوونە حەفت هەشت ساڵێك دەیان بردن بۆ لای شێخ و هەندێك لە بسکەکەی دەبڕێت ئەوەش مەبەستێکی دینی هەبووە) دیارە بەهۆی ئەو پیرۆزییەوە گوازراوەتەوەو ماوە لەناو بیرو هزری خەڵکیدا.



(وێنە-٣٩) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

بۆ خۆم پێم وایە وێنە مەقەس لەسەر گۆڕەکان جگە لەو بایەخ و پیرۆزییەی کە باسکرا هۆیەکی تری هەبێت. یا ئەوەتە نیشانەیە بۆ پیشەی مردووەکە یاخود لەبەر ئەوەی مەقەس نیشانەی بڕینەو مردنیش بڕاندنەوەیە بۆ ژیان جا لەبەر ئەوە وێنە دەکرێ لەسەر کێلەکە واتە؛ ئەم کەسە ژیانی کۆتایی پێ هات و بڕایەوەو هەروەها لەبەر ئەوەی لەلای سەرەوەی کێلەکە نووسراوە (یا غفار) دیارە گۆڕەکە هی موسڵمانەو بەتایبەتی ئافرەتیش بووە بەهۆی ئەو ملوانکەو بازنانەی لەسەر گۆڕەکە کراوە، مامۆستا (دڵشاد) سەبارەت بە وێنەی مەقەسەکە وتی بۆ نیشانە نەبێ بۆ پیشەی مردووەکە بۆ نموونە بەرگدرووبێت یاسەرتاش، و لە بارەی ئەو وێنەیەی کە ئێمە بە ملوانکە دامان نا ئەو بەدوعا چواندی ئەو دوعاو نوشتانەی کە لەکۆندا دەکرا بۆ حەسوودی و نەخۆشی و... هتد. ئەوەش ڕێی تیا دەچێ، جا ئەگەر ئەو وێنەیە دوعا بێت و بوونی لەگەڵ مەقەسەکە لەسەر یەك گۆڕ و لەیەك کاتدا دەکرێ بەوە لێکبدرێتەوە کە مردووەکە بە گەنجی مردووەو دوعاکەش نیشانە بێت بۆ ئەوەی کە دوعا کراوە، واتە مردووەکە



دوعایی لێ کراوە بۆیە مردووەو ئەم جۆرە بیرو بۆچوونانەش زۆر باو بووە لەناو هزرو بیری خەڵکی هەر لەبەر ئەوەش بوو بیرم بەو لایەدا چوو خۆ دەکرێیش هیچ لەو مەبەستانە نەگەیەنێت کە ئێمە باسمان کرد بەڵکو ئەو کەسەیی کە وێنەی کردووە لە سەر گۆڕەکە بۆ مەبەستێکی زۆر جیاواز ئەو کارەی کردبێ.

چەند گۆڕێکی تر کەوتنە بەرچاومان کە بەهەمان شێوە وێنەی ملوانکەو شێوەی بازن و شتی وای لەسەر بوو، ئەم گۆڕانە ناوی مردووەکەی لەسەر تۆمارکرا بوو و مێژوویەکی زۆر کۆنی نییە بۆ شەست و حەفتاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوەو بێگومان مردووەکە ئافرەتە ئەمەش بۆمان زیاتر دەسەلمێنێ کە ئەو شێوە بازنەیی و نیوە بازنەیانەی لەسەر کێلەکان وێنەکراون نیشانەیە بۆ کەرەسە جوانکارییەکانی ئافرەت و لە هەمانکاتیشدا نیشانەیە بۆ ئافرەت خۆی جا لەبەر ئەوە لەسەر گۆڕی ئافرەتەکان وێنە دەکرێ، زیاد لەوەش شتێکی تر سەرنجی ڕاکێشایین ئەویش بوونی ملوانك و بازن بەزۆری و بەتایبەت لە گۆڕستانی (چراغ)ی هەولێر، ئەوەش دیارە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئافرەتی هەولێر هەر لەکۆنەوە بایەخی بە ئاڵتون و شتە جوانکارییەکانی ئافرەت داوە لەبەر ئەوە وێنەکەی لەسەر گۆڕەکانیان کراوە.

لەڕێی ئەو ناوانەی لەسەر گۆڕەکان خوێندمانەوەو لە شێوەی گۆڕەکەوە هەستێکی لات دروست دەکرد کە ئەم مردووە یاخود ئەم گۆڕە، گۆڕی کچێکە کە کەس و کارەکەی لەڕووی ئابووریەوە باشن و پایە بەرزبوونە، یاخود ئافرەتەکە بۆ خۆیی ئافرەتێکی دەوڵەمەند بووە (وێنە-٤٠-أ) گۆڕی (نزاهت بنت محمد کهریزجی)یە کە لەساڵی **١٩٦٥** کۆچی کردووەو بەختی (ثلث) لەسەر گۆڕەکەی نووسین کراوەو لە سەرەوەی کێلەکە نووسراوە (یا غفار)و لە خوارەوەی کێلەکەو لە تەنیشتی لای چەپی دوو بازنە لەسەر یەك کراوەو لەلای ڕاستیش دوو هێمای ئۆمێگا یاخود خرخاڵ بە تەنیشت یەکەوە کراون و لەژێریانەوە سێگۆشەیەك کراوەو خڕێکی ڕەشی پێوە نووساوە ئەمەش زۆر بە ملوانکە دەچێ، مامۆستا (دڵشاد) بازنە بەنیشانەی بەردەوامی یان بەردەوام بوون (الاستمرارية) دادەنێت و ئەوەی تر بە نیشانەی ئۆمێگاو سێگۆشەکەش بەنیشانەی سیحر دادەنێت گوایە سێگۆشە زۆر لەسیحردا بەکارهاتووە یاخود دەڵێ ئەو سێگۆشەیە لەگەڵ بازنەکەی پێوەیی نووساوە بە ئیمامی تەسبحیش دەچێ و دەشێ ملوانکە بێت. (وێنە-٤٠-ب)ش گۆڕی ئافرەتێکە بەناوی (روناك حاجی سلێمانی- ١٩٦١-**١٩٧٣**) بە هەمان شێوە وێنەی بازنەو ملوانکەو خرخاڵ لەسەر کێلەکەی کرابوو و لەسەر کێلی لای پێی گۆڕەکەی نووسرابوو (کل من عليها فان ). (الرحمن/٢٦).

گۆڕێکی تر هەر ملوانکەی لەسەر بوو، ملوانکەیەك و شتێکی تر کە هەر بەملوانکە دەچوو (وێنە-٤١) مامۆستا (عبدالرقیب) پێی وایە کە ئەو شتەی دووەمیان دوعای سەرسنگی ژنە، خشڵێکی ژنەو مانای ئەوەیە خاوەنی قەبرەکە ژنە.



(وێنە- ٤٠-أ) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنە-٤٠-ب) (گۆڕستانی چراغ- هەولێر)





(وێنە-٤١) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

(وێنە-٤٢) گۆڕێکە دوو بازنەی کراوەیی لەسەر کراوە، هەروەها شێوەیەکی تر کە سەرەتا وا دەزانیت ملوانکەیە، بەڵام ئەگەر لەتەنیشتەوە تەماشایی بکەی بۆت دەردەکەوێ کە دوو وشەی (محمد) نوسراوە پیتی (د)کەی دەگاتەوە بەیەك و لەسەرەوەی ئەم نووسینەش هێمایەکی تر وێنەکراوە. هێماکە بە پیتی (B) ئینگلیزی دەچێ سەرەتا ڕاستەوخۆ سەرنجمی بۆلای ئەو هێمایانە ڕاکێشا کە لەکتێبی فەلەکی (ئستورلاب)دا هاتووە بۆ ئاماژە کردن بە هەسارەکان، چونکە شێوەی (B) لە ئوستورلابدا نیشانەیە بۆ هەسارەی خۆر، بەڵام لەبەر ئەوەی دوو هێمایەو یەکیان لایەکی تەواو نەکراوە بۆ بۆچوونێکی تر چووم ئەویش دوور نییە ئەم وێنانە وێنەی قفل بێت یەکیان کراوەتەوەو ئەوی تریان داخرابێت یاخود نیشانە بێ بۆ گوارەی گوێی ئافرەت. بەهەر حاڵ ژمارەی ئەو گۆڕانەی کە بازنەو ملوانکەی لەسەر کرابوو زۆر زۆر بوون و ئەوەی جێی سەرنج دەمێنێتەوە ئەوەیە بۆ بەردەوام دوو بازنە وێنە کراوە لەسەر گۆڕەکە و زیاتر یان کەمتر نییە؟!



(وێنە-٤٢) گۆڕستانی چراغ — هەولێر

هەر لە گۆڕستانی (چراغ) دەمێنینەوەو چەند گۆڕێکی ترمان بەرچاو کەوت کە وێنەی خەنجەر و تفەنگ و دەمانچە و شتی وای لەسەرە (عبدالرقیب یوسف) لەم بارەوە ووتی: (ئەو شێر و دەمانچە و مەقەستانەش هەمووی هی قەڕنی نۆزدەهەمن و هەندێکی هی سەدەی بیستەمەو هەر گۆڕستانێك بەپێی مێژووەکەی خۆی و ئەمانەی شێخەڵلا لە سەدەی هەژدەهەم بەولاوە تێناپەڕێنێ و بەگشتی نیشانەی دەسەڵاتداری و میرخاسییە).



(وێنە- ٤٣) گۆڕستانی چراغ- هەولێر





(وێنە- ٤٤) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

(وێنە-٤٣) کێلی گۆڕێکە خەنجەرو دەمانچەیەکی لەسەر وێنەکراوەو لەبەر سەر کێلەکەش وێنەیەکی تر هەیە کە بەنیشانەی سەرەگا دەچێ، مامۆستا (دڵشاد) ئەگەری ئەوەی دانا وێنەی جۆرێك بێت لە دەمانچە یاخود هەر سیلاحێك و هەردوو دەسکەکەی بەدەسکی تفەنگ یا دەمانچە چواند، هەر بۆ خۆشی باسی ئەوەی بۆ کردین کە لە نووسینی سۆمەری بەگا وتراوە Gud و نووسینەکەی بەم شێوەیە ( ∀) و لە (بابلی) یش پێی وتراوە Alpu ئەلفا ( ∀ ) و لە نووسینی ئەبجەدی فینیقی کە سەرەتای هەموو ئەبجەدییەکانە تەنانەت یۆنانی و لاتینی و ئینگلیزیش پێی دەوترێ Ulpha اولفا، و لەسەر شێوەی سەرەگا دەنووسرا، بەڵام بە عەکسەوە، واتە دەکرێ و هیچ دووریش نییە ئەو وێنەی لای سەرەوەی کێلەکە ئاماژە بێت بۆ سەرەگا.

(وێنە-٤٤)یش بە هەمان شێوە گۆڕێکە وێنەی خەنجەر و کولەکە ڕۆنی چەورکردنی خەنجەرەکەی بەسەرەوەیە، و وێنەیەکی تری لەسەرە بە شێوەیی بازنەیەك کە دوو لای هەیە، وەکو شێوەی سەعاتی دەست دێتە بەرچاو، هەروەها پێی دەچێ نیشانەبێ بۆ پشتدێن کە لەکۆندا باو بووەو ناوەڕاستەکەی (قرصێك) بازنەیەکی ئاسن بووەو زۆرجار نەخش و نووسینی

لەسەرە کراوەو پیاوان دەیانبەستە خۆیانەوەو دەستووری موسڵمانە کۆنەکان بووە بەتایبەتی لە شەڕەکاندا بەکارهاتووە، جگە لەوەی هەمان وێنە کە لەسەر کێلی (وێنە-٤٣)دا کرابوو لەسەرەوەی ئەم کێلەش هەبوو جا ئەگەر بە سەرەگا دایبنێین یا بە ئامێرێکی شەڕ، گرنگ ئەوەیە لەلای سەرەوەی کێلەکە وێنە کراوەو لەژێریەوە خەنجەر و کولەکە ڕۆنەکەو پشتدێنەکە وێنەکراوە. وبەگشتی بوونی خەنجەرو ئەو شتانەی تر لەسەر گۆڕەکە ئاماژەیە بەوەی مردووەکە خاوەنی ئەو شتانە بووەو لەژیانی ڕۆژانەیدا بەکاری هێناوە واتە مردووەکە یا ئاغا و خاوەن دەسەڵات بووە یا کابرایەکی دەوڵەمەند یاخود شەڕزان بووە، بەهەر حاڵێك نیشانەیە بۆ پیاوێکی دەسەڵاتدار.

لەسەر کێلی گۆڕێکی تر وێنەی تفەنگ و دەمانچەیەك کراوە جگە لەوەش وێنەیەکی تر هەیە لە نێوان دەمانچەکە کە لەسەرەوەی کێلەکە وێنەکراوەو تفەنگەکە کەلەلای خوارەوەی کێلەکەیە، ئەم وێنەیەی ناوەڕاست بە کلیل دەچێ یان فیشەك دان و زیاترین ئەگەر ئەوەیە فیشکدان بێ یان هەر پارچەیەکی تر کە پەیوەندی بە تفەنگەوە هەبێ و لە هەمانکاتدا دەکرێ بڵێین بە ئامێری مشار یان ئامێریی فویی مۆسیقا دەچێ بڕوانە (وێنە- ٤٥) هەر وەکو وتمان تفەنگ و دەمانچەش نیشانەی دەسەڵاتە.

گۆڕێکی تر کە زۆر کۆن نییەو وێنەی مێزێکی لەسەر کراوەو لەسەر مێزەکەش شێوەی پەرداغێك یان پیاڵە یا گلاسێك وێنەکراوە پێی دەچێ گوڵدان بێ، بەڵام گوڵی تیادانییە یاخود گوڵی تیادا بووە، بەڵام ڕەنگەکەی ڕۆیشتۆتەوە. دەکرێ ئەو پیاڵەیە یا ئەو پەرداغەی لەسەر مێزەکە کراوە نیشانە بێ بۆ عەرەق خواردن (خوا دەزانێ)، چەند کەسێك وێنەکەیان بینی و هەمان بۆچوونیان هەبوو، ناوی مردووەکە لەسەر گۆڕەکە تۆمار کراوە (رشید احمد محمدامین) (١٩٥١-١٩٩٣) و لەژێرەوەی نووسراوە (بێ کەس ) و لەسەر کێلەکەی لای پێی نووسراوە (ان وعدالله حق) و لەتەنیشتەکان (کل نفس ذائقة الموت) (١٨٥-ال عمران) بڕوانە (وێنە- ٤٦).





(وێنە-٤٥) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنە-٤٦) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

کێلێکی تر هەر لە گۆڕستانی چراغ (وێنە-٤٧) کێلێکە زۆر نەخشێنراوە لەلای سەرەوەی کێلەکە وێنەی دوو سەری بچووك کراوە لە ناوەڕاستیدا بازنەیەکی پلێەدارو هەروەها شێوەی ئەندازەیی لەسەر کراوە لاکێشەو بازنەو لەگەڵ ئەوانەشدا وێنەی مەقەسێك لەلای چەپی کێلەکە و وێنەی ئاوێنەیەك لەلای ڕاستی کراوە. لە وتار و قسەکانی (عبدالرقیب یوسف) مەقەس بەنیشانەی شێخ مەند دادەنێت و بوونی بۆ ئەو پیرۆزییە دەگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەم گۆڕە باوەڕ ناکەم هی یەزیدی بێت و دەکرێ مەبەستێکی تری لەدواوە بێت، بۆ نموونە نیشانەبێ بۆ پیشەی مردووەکە، واتە بۆ مردووەکە سەرتاش نەبووبێ چونکە لە هەمانکات مەقەس و ئاوێنەش بەیەکەوە وێنە کراوە لەسەر کێلی گۆڕەکە. دیارە مەقەس لەناو کەلەپووری میللیدا واتای زۆری هەڵگرتووە چونکە ئامێرێك بووە پرچیان پێ بڕیووەو پرچ بڕینیش بە تایبەتی بۆ ئافرەت عەیب بووە یاخود وەکو سزایەك بووە لەکۆندا جا لەبەر ئەوە دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ ناو کەلەپوور و لەوێ لە تایبەتییەکانی مەقەس بگەڕێین ئەو کاتە مەبەستەکانیشی لەلامان ڕوون دەبێتەوە، چونکە مەقەس هێمایەك بووە چەند واتایەکی لەخۆ گرتووە. ئەگەرچی وردە وردە ئەو شتانەش باوی نامێنێت و بەرەو لەناوچوون دەچێت لەگەڵ پێشکەوتنی لایەنی ڕۆشنبیری و هزری مرۆڤدا.



(وێنە-٤٧) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



ئاشکرایە بەسەرچوونی چەرخەکان و تێپەڕبوونی ڕۆژگار زۆر شت دەگۆڕینی، گۆڕستانیش لەو گۆڕانە بێ بەش نییە، سەردەمێك ڕەمز و هێما کۆمەڵێك واتایان لەخۆ گرتبوو و بۆ دەربڕینی مەبەستەکان بەکار دەهات، بەڵام ئێستا نووسین هەموو شتێکمان بۆ باس دەکات، ئەمە واتای ئەوە ناگەینێ کە ڕەمز بوونی نەماوە، چونکە هەر نووسین بۆ خۆی ڕەمزە، بەڵام شێوەی ڕەمزەکان وردە وردە گۆڕانی بەسەردا دێت چونکە دەوروبەری ژیان و بارودۆخەکەی دەگۆڕێ، جا ئەمڕۆ لەبەری ڕەمزە کۆنەکان (شێرو خەنجەرو خۆر...هتد ) ڕەمزی نوێمان دەکەوێتە بەرچاو لەسەر گۆڕەکان بۆ نموونە: لە گۆڕستانی سەیوان لە سلێمانی گۆڕی ئەفسەرێکمان بینی بەناوی (عبدالقادر عزت عبدالرحمن) لە ١٩٧٨ کۆچی کردووە ئێمە لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا باسی شێوازی ئەم گۆڕەمان کردووە جا لەسەر شانی کێلی گۆڕەکەی پلەی ئەفسەرییەکەیان وێنە کردبوو (سێ ئەستێرە، تاجێك و دوو شێر) بڕوانە (وێنە-٤٨)، واتە ڕەمزەکان وەکو خۆی نەماوەتەوەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە بەپێی سەردەمەکە.

ئەگەر بەناو گۆڕستاندا بگەڕێین کۆمەڵێك گۆڕمان بەرچاو دەکەوێ کە بایەخێکی زیاتری پێ دراوە لەوانی تر، ئەوەش گۆڕی شەهیدەکانە جا چ شەهیدی شەڕی ئێران و عێراق بێ یان پێشمەرگە بوو بێت یا لە (٩١) شەهید بووبێ یا ئەنفال بێ یا لەشەڕی ناوخۆ کوژرابێ یا لە سجنەکانی بەعسیدا شەهید بووبێ... هتد. ئەو پایەی کە شەهید هەیەتی لەناو کۆمەڵ بۆتە هۆیی ئەوەی کە بایەخ بە گۆڕەکانیان بدرێ و ڕەمز و نووسینێکی زۆر لەسەر کێلەکانیان بکرێ، زۆرجار بە ئاڵا یا بەوێنەی شەهیدەکە خۆی گۆڕەکەی نەخشێنراوە (وێنە-٤٩) یاخود بە نووسینی شیعر و ئایەت کە باس لە نەمری و کورتی تەمەنی شەهید و گیان فیدایی و خۆ بەخشندەیی شەهید دەکات لە پێناوی میللەت وڵات.



(وێنه- ٤٨) گۆڕستانی- سەیوان- سلێمانی

گۆڕی ئەفسەرێکە دوو کێلی بۆ دروست کراوە یەکیان هەر لەگەڵ گۆڕەکەیە ئەوی تر بۆیی دروست کراوە و لەسەر شانی کێلەکە پلە عەسکەرییەکەی وێنەکراوە.




(وێنه-٤٩) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



له گۆڕستانی شاخکی له دهۆك دوو سێ گۆڕ وێنەی تفەنگ و دەمانچەی لەسەر کراوە کە هەموویان شەهیدی ئێرانن (وێنه-٥٠) بە واتای ئەوەی ئەو کەسە لە شەڕدا شەهید بووە. بەگشتی لە هەموو گۆڕستانەکاندا بایەخ دراوە بە گۆڕی شەهیدو وێنەو ڕەمزی لەسەر کراوە کە نیشانەیە بۆ شەهیدبوونی کەسەکە. جگە لەوە کورد بەردەوام مەسەلەیەکی لە ئارادا بووە ئەویش مەسەلەی نیشتمان پەروەریە و خەباتە بۆ ڕزگاربوون ئەمەش ڕەنگیداوەتەوە لەناو لەناو دەروون و دڵی خەڵکی، زۆرجار وێنەی ئاڵای کوردستان بەسەر کێلەکانەوە هەیە (وێنه-٥١) کە نیشانەیە بۆ خۆشەویستی مردووەکە بۆ خاك و وڵاتەکەی دیارە ئەمەش پاش نەمانی دەسەڵاتی بەعس، چونکە حکوومەتی بەعس ئەو شتانەی هەموو قەدەغەکردبوو و کەس نەیدەوێرا هیچ شتێك بنووسێ یاخود ئاڵا هەڵواسی یان وێنەی بکات لەسەر گۆڕەکان، بەڵام ئێستا سانسۆر نەماوە و بە ئارەزووی خۆیان خەڵکەکە ئاڵا دادەنێن و شیعر دەنووسن.



(وێنه-٥٠) گۆڕستانی شاخکی- دهۆك

لەلایەکی ترەوە لەبەر هەبوونی چەند پارت و لایەنێك دەبنین ئارمی ئەو پارتانە لەسەر هەندێ کێل بەتایبەتی کێلی شەهیدی ئەو پارتانە وێنەکراوە، وەکوو ئاماژەیەك کە ئەمە شەهیدی فلانە حیزبەو ئەو گۆڕەی تر هی حزبێکی ترەو... هتد. یاخود لەخۆشەویستی خەڵکەکە بۆ پارتەکانیان ئارمەکانیان لەسەر گۆڕی مردووەکانیان وێنە دەکەن بڕوانە (وێنه-٥٢).



( وێنە-٥١) گۆڕستانی شێخ محی الدین- کەرکووک



(وێنە- ٥٢) گۆڕستانی شەهیدان- سلێمانی



هەموو دەزانین کە هەمیشە گوڵ وێنــەی جـوانی بـووەو دیارییــەکی بـە نـرخ بـووەو وەکـو نیشانەی ڕێزلێنان براوە بۆ سەر گۆڕەکان یاخود لە دەوروبەری گۆڕەکان دەچێنرێ جا لەبەر ئەوە زۆر جاریش. وێنەی گوڵ و گەڵا لەسەر کێلەکان نەخـشێنراوە یـا هــەڵکۆڵراوە لەســەری بڕوانـە (وێنە-٥٣-أ) و (وێنە- ٥٣-ب).

توێژێکی تری کۆمەڵ کە ناکرێ لەبیر بکرێن ئەویش هونەرمەندانە. گۆڕی هونەرمەنـدانیش زۆرجار وەکو پێزانینێك بۆ خزمەتەکەیان بایەخ بە گۆڕەکانیـان دەدرێ شـاعیرەکان شـیعرەکانی خۆیان گۆڕەکانیان دەڕازێنێتەوە، و هونەرمەندانی تر ئاماژەیەك لەسەر گۆڕەکانیـان هەیـە کـە ناسنامەی هونەرمەندێتی کەسە مردووەکە دەستنیشان دەکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لە گۆڕی هونەرمەندان و دڵسۆزانی ئەم وڵاتە هەر کەس نازانێ لە کوێیەو نەك بایەخی پـێ بدرێ بەڵکو زۆر چاویشی لێ پۆشراوە.



(وێنە-٥٣-أ) گۆڕستانی شاخکی- دهۆك



(وێنە-٥٣-ب) گۆڕستانی چراغ- هەولێر

نموونەیەك لە ڕەمزە هونەرییەكان لە گردی سەیوان بوو، كێلی گۆڕەكە وێنەی دوو دەمامك كە تایبەتە بە شانۆوە لەسەری كراوە، ئەم گۆڕەش گۆڕی (حسین قەرەداغی)یە، هونەرمەندی شانۆكاری شاری سلێمانی كە لەسەر تەختی شانۆ كۆچی دوایی كردووە و لەسەر كێلەكەی وێنەی دوو دەمامك هەبوو لەگەڵ پەردەیەكی هەڵواسراوی شانۆ، پەردەكە هەڵدرابۆوە، بەڵام ئەمجارەیان بۆ پێشكەشكردنی شانۆگەری نەبوو بەڵكو پەردە لەسەر ناوی مردوویەكی شانۆكار هەڵدرابۆوە، بڕوانە (وێنە-٥٤).

كێلێكی تر وێنەی منارەو گومەزی مزگەوتی لەسەر كرابوو، ئەم جۆرە وێنانەش زیاتر لەسەر كێلی پیاو چاكان و پیاوی ئایینی هەبوو، كە ئەمانیش چینێكی ترن و لایەنێكن لە گۆڕستان بڕوانە (وێنە-٥٥).



(وێنە-٥٤) گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی





(وێنە-٥٥) گۆڕستانی سەیوان سلێمانی

ئەگەر بێت و لەتەواوی گۆڕستانەكان بگەڕێین بێگومان وێنەی زیاترو ڕەمزی زۆرترمان بەرچاو دەكەوێ كە واتای جیا جیا دەبەخشێت، هەیە لەسەرداواكاری مردووەكە خۆی وێنە كراوە یاخود كەس و كاری مردووەكە لەخۆشەویستیانا بۆ مردووەكەیان بایەخ بەدوا مەنزڵگاكەی دەدەن، یاخود تەنها بە مەبەستی خۆ دەرخستن بەناوی بنەماڵەو پایەی كۆمەڵایەتی و سیاسی و...هتد، بایەخ بە گۆڕەكان دەدەن. بەهەر حاڵ ڕەمزو وێنە هەر لەكۆنەوە بوونی هەبووە لەسەر گۆڕەكان دیارە ڕەمزە كۆنەكان مەبەستێكی قوڵ تر دەدەن، یاخود نامۆترن بۆ ئێمە چونكە سەر بەسەردەمێكی جیاوازن، بەڵام ئەو وێنەو ڕەمزانەی كە ئێستا هەن زیاتر پەیوەستن بە ئێستای ژیانی كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری و كەلتووری میللەتێك و پاش چەند سەدەیەكی تر دەبێتە جێی تێڕامانی كەسەكانی پاش ئێمە جا لەو بۆچوونانە دەگەڕێین كە لەپشت ئەم شێوازە بیركردنەوەیە بووە، هەروەكو چۆن ئێمە ئێستا بەدوای نهێنی شتە كۆنەكاندا دەگەڕێین و لامان گرنگە لە بیركردنەوەی ئەوانی پێش خۆمان بگەین و مێژووەكەیان بزانین، جا لەم باسەدا هەوڵمدا باسی هەندێك لە ڕەمزە نوێیەكان بكەم و لە بارەیانەوە بدوێم تاكو پاشەڕۆژ كار ئاسانی بكات بۆ ئەوانەی پاش ئێمە دێن و لە ڕەمزەكانی ناو گۆڕستان دەكۆڵنەوە.

وێنەی سەر چەند گۆڕێك بە شێوازێكی هێڵكاری



گۆڕی (وێنە- ٣٤)



گۆڕی (وێنە- ٣٦)



گۆڕی (وێنە- ٣٨)



گۆڕی (وێنە- ٣٧)





گۆڕی (وێنە- ٣٩)



گۆڕی (وێنە- ٤٤)



گۆڕی (وێنە- ٤١)



گۆڕی (وێنە- ٤٢)

## نووسین لەسەر گۆڕەکان

### پێناسەو گرنگی بایەخدان بە نووسینی سەر گۆڕەکان:

مرۆڤ کە لەبەردەم دیاردەی مردندا بێ دەسەڵات ڕاوەستا کەلێنێکی گەورەی لا دروست بوو لە ناو هەست و دەروون و سۆزی کە ڕەنگیدایەوە لەسەر جۆری بیرکردنەوەو ڕێچکەی تێفکرینی بەرامبەر بە دیاردەی مردن، جا بەهەر شێوەیەك بێت هەوڵیدا ئەو کەلێنە پڕ بکاتەوە لە ئەنجامدا بە ڕەش پۆشین یاخود بەگریان و لاواندنەوە ئەو هەڵچوونە دەروونییەی خۆیی دەربڕی. لەلایەکی تر ئەو سروشتە کۆمەڵایەتییەی کە مرۆڤ هەیەتی و پابەندبوونی بە ڕابردوو وای لێکرد نەتوانێ دەست بەرداری یادگاری کەسێك بێت کە ڕۆژگارێکی لەگەڵدا بردۆتە سەر بەتایبەتی ئەگەر کەسەکە نزیك بێت لێوەی، لەبەر ئەوە هەوڵیدا ناوی ئەو کەسەو شوێنی لەسەر گۆی زەوی بپارێزی بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ئەو شوێنە بیسەلمێنێت کە مرۆڤێکی تر هەبووەو لەم گەردوونەدا ژیاوە ئەو شوێنە گۆڕە کە مردووەکە دەپارێزێ و دوا جێگای لەشی مرۆڤە، نووسینی سەر گۆڕەکانیش مێژووەکەیانە.

پیرەمێردی شاعیر لەم بارەوە دەڵێ:

**کێلی گۆڕەکان نامەی ئاشکران**
**لە عوقباوە بۆ زیندووەکان نووسران**(٧٠).

جا بۆ ئەوەی گۆڕەکە بناسرێتەوەو زانیاری لەبارەی کەسەکەوە تۆمار بکرێ نووسین لەسەر کێلی گۆڕەکان هاتە کایەوە، و نووسینی سەر گۆڕەکان دوو لایەنی هەیە. لایەنێکی تۆمارکردنی کۆمەڵێك زانیارییە، زانیارییەکانیش بریتین لە: ناوی مردووەکە نازناوی، خێڵەکەی هەروەها ساڵی لە دایکبوونی و کۆچکردنی جاروا دەبێ پیشەو کاری مردووەکەش دەنوسرێ و هۆی مردنەکەش دەستنیشان دەکرێ و... هتد، لایەنەکەی تر بریتییە لە نووسینی پەند و ئایەت و قسەی نەستەق و شیعر لەسەر گۆڕەکان بێگومان ئەو ئایەت و پەندانەی کە دەنووسرێ پەیوەندی بەدیاردەی مردنەوە هەیەو باسی فەلسەفەی ژیان و مردن دەکات، یاخود شیعرەکان

(٧٠ ) پیرەمێردی نەمر، نووسینی محمد رسول (هاوار)، چاپخانەی (العانی)، بغداد، ١٩٧٠، ل٢٩٥.



باس لە بەسەرهات و ئارەزوو حەزەکانی ژیانی کەسە مردووەکە دەکات یاخۆ باس لە نەهامەتی و ناخۆشی کەس و کاری مردووەکە دەکات لەپاش لەدەستدانی خۆشەویستەکەیان (مردووەکە).

دیارە ئەو نووسینانەی کە دەکرێ لەسەر گۆڕەکان بە بەکارهێنانی جۆرەکانی خەتی (ثلث و رقعەو دیوانیەو فارسی...هتد)یە، جاری واش هەیە ئەو کەسەی کە نووسینەکە دەنووسێ لە کۆتاییەکەیدا واتە لەژێر نووسینەکەوە ناوی خۆی دەنووسێ یاخود ناوی ئەو کەسەی کە شیعرەکەی وتووە، جاری وایە شیعرەکە هی مردووەکە خۆیەتی جاریش هەیە کە هیچ ناوێك تۆمار نەکراوە لەسەر گۆڕەکە کە ئاماژە بە خاوەنی نووسینەکە بکات.

ئەم دیاردەی نووسین لەسەر گۆڕە، تەنها لەناو کوردا نییە، بەڵکو لەکۆنەوە لەناو میللەتان بەتایبەتی گریکی و رۆمانییەکاندا هەبووە بەناوی ئیپیتاف (Epitaph) یان ئیپیگرام (Epigram)* ی پێ وتراوە.

ئیپیتاف وشەیەکی گریکییە واتای نووسین لەسەر گۆڕەکان دەگەیەنێ یاخود نەخشکردن لەسەر مەزارو گۆڕەکان، ئەم نووسینەش جۆرێك بووە لە خوا حافیزی کردن کە لە شێوەی پیاهەڵدان یا بەرزکردنەوە بووە یان لەشێوەی ڕسواکردن بووە(٧١).

یاخود پێناسە کراوە بەوەی پاراگرافێکە پایەی مردووەکە بەرز دەنرخێنێ و بە شێوەیەکی گشتی لەسەر گۆڕەکە یا لەسەر پارچەیەکی دیاری کراو دەنووسرێ و زۆرجاریش ئیپیتافەکان لەشێوەی پەخشاندا دەبن، بەڵام نموونەی تریش هەیە وەکو دەزانین هەندێك لە شاعیران ئیپیتافی تایبەتیان بۆ خۆیان دروست کردووە(٧٢).

* ئیپیگرام سەرەتا لای گریکەکان واتای نووسینی دوو دێرە شیعری سەر گۆڕەکانی دەگەیاند، بەڵام پاشان سنوورەکەی فراوان بووە بۆ جۆرێکی شیعری تایبەت کە لەسایتی http//www.new.potets press.com/epigram.htm/ بەم شێوەیە پێناسە کراوە: ئیپیگرام چامەیەکی کورتە، ڕەوانبێژییەکی وردی تیا بەکاردەهێنرێ جاری وایە شێوازێکی گاڵتە جاریانەی تیا بەکارهێنراوە. ئیپیگرام پێویستی بە خێرایی و وردی و توانایەکی بەهێز هەیە لە دەربڕینی ڕاستەوخۆ و ئیپیگرام کۆمەڵێك واتای شاراوە لەخۆ دەگرێ و زۆرجار کێش و سەروایەکی تایبەتی بۆ بەکاردەهێنرێ و زیاتر بۆ مەبەستی داشۆرینی سیاسی و ئەدەبی و کێشە کۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێنرێ و هەروەها وەکو ڕەخنەگرتنێکە بەشێوازێکی خۆش.

(٧١) A Dictionary of literary terms, J.A.Cuddon Revi, peblishedin penguim books, 1984.U.S.A, , page 237

(٧٢) http://en.wikipedia.org/wiki/Epitaph#famousEpitaphs.

و سەبارەت بە (ئیپیگرام)یش لەلای گریکی کۆن سەرەتا بە ئەو قەصیدە کورتانە دەوترا کە وەکو ڕەمزێك لەسەر گۆڕەکان دەنەخشێنراو لەمەوە دەگەینە ئەوەی وشەی (Epigram) واتای (نووسین لەسەر) دەگەیەنێ و بناغەی وشەکە گریکییە، ولای ڕۆمانییەکان چامەیەکی کورتە نەواخنێکی زۆرتری هەبووە لەهی یۆنانییەکان، ئەم چامە ڕۆمانیانە زیاتر داشۆرین بووەو هەندێ جار وشەی ناشیاوی تیادا بەکارهاتووە تا کاریگەری بکاتە سەر ناوەڕۆکی شیعرەکانیان[٧٣].

هەروەها لە پێناسەیەکی تردا، ئیپیگرام بریتییە: لەو نووسینەی کە لەسەر پەیکەر و مەزار و گۆڕەکان نووسراوە پاشانیش پەرەی سەندووەو بۆتە جۆرێك لە جۆرە ئەدەبییەکان، لەسەدەی (١٧)هەم دا ئیپیگرام بەرەو پێش چووە لەسەر دەستی ((William Drammond، (Danne)، Herrieke Jonson))، و بەهەمان شێوە لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم لەلایەن (Richerd pope) و (Burnsard blake) و (Coleridge) و ...هتد. پاشان ڕێژەی ئیپیگرام کەم بۆوە، بەڵام زۆربەی خەڵك بەکاری دەهێناو بەتایبەتی لەسەدەی (١٦)هەمدا بۆ دەربڕینی یان ئاماژەدان بەشتێك بە وردی و بەخۆشی[٧٤].

بوونی دێری شیعر لەسەر گۆڕەکان لەناو گۆڕستانەکانی کوردستان ئێستاش دەدۆزرێتەوە، زۆربەی گۆڕەکان شیعریان لەسەر نووسراوە جگە لەزانیارییەکانی تر وەك ناوی مردووەکەو ساڵی لە دایکبوون و کۆچکردنی ...هتد، گرنگی ئەم نووسینانەی لەسەر گۆڕەکان کراوە لەوە دایە کە ئەم نووسینە وەکو مێژوویەك دەمێنێتەوە لەسەر گۆڕەکان و هەر کەسێك بیخوێنێتەوە ئاشنا دەبێت بەناوی کەسێکی خاوەن ئەزموون لەژیان کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەندامێك بووە لە کۆمەڵێ مرۆڤایەتی و هەر لەڕێی ئەو نووسینانەوە دەتوانین لایەنی بیرکردنەوەو سیستەمی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ئەو شوێن و میللەتە دەستنیشان بکەین کە خاوەن گۆڕەکانن زۆر جاریش بە بۆنەی ئەو نووسینانەوە سەلماندوویانە کە لەناوچەیەکی دیاری کراودا جۆرە میللەتێك ژیاوەو جۆرە شارستانییەتێك هەبووە، واتە بۆ ناسینەوەی ئاسارو مێژووی شوێنی گەلەکانیش سوودی لێ دەبینرێت. ئەمە گرنگی ئەو نووسینانەبوو لە ڕووی کەلتووری و مێژوویییەوە، لایەنێکی تریش هەیە ئەوەش لایەنە ئەدەبییەکەیە. چونکە ئەو شیعرانەی کە لەگۆڕستاندا هەیە دەچێتە

(٧٣) http//www.m-w.com/dictionary/epigram.

(٧٤) A Dictionary of literary terms, page ٢٣٧-٢٣٨.



ناوخانەی ئەدەبیات و لەژێر ناوێکی تایبەتیدا کۆبۆتەوە (ئەدەبی لاواندنەوە) ئەگەرچی ئەوەی لەسەر گۆڕەکاندا هەیە تەنها لاواندنەوە نییە، بەڵام هەر چییەك بێت دەربڕینەو لە ناخی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووەو دەچێتە خانەی شیعرەوە واتە بەهرەیەو جۆرە مەبەستێکی دیاریکراوی لە پشتەوەیەو هەمیشە هەوڵدراوە زۆرترین و قوڵترین مەبەست و واتا بە کەمترین وشە دەربڕدرێت کە باس لەشتێکی مەزن بکات، و ئەم دەربڕینە پڕە لە هەست و سۆز هەروەها باس لە بیرکردنەوەی تایبەتی مرۆڤ دەکات لە مەڕ کێشەکانی ژیان و مردن، و ئەمەش وای لێدەکات ببێتە لایەنێکی گرنگ لەناو مێژووی ئەدەبیات و نرخی هونەری و مێژوویی ئەو نووسینانە شایەنی ئەوەیە ئاوڕی لێ بدرێتەوە.

## هەندێك نموونەی گشتی لەسەر نووسینی سەر گۆڕەکان:

نووسین لەسەر گۆڕەکان نەریتێك نییە کە تەنها میللەتێك پەیڕەوی بکات، بەڵکو ڕیشەی ئەم نەریتە لەلای زۆربەی گەلاندا هەیەو نموونەی زۆرە، و لەناو گۆڕستانەکانی کوردستانیش بەتایبەتی کوردستانی باشوور نووسین لەسەر گۆڕەکان زۆرەو جگە لە ئایەت زۆربەی نووسینەکانی تر شیعرە، دوو دێر یان زیاتر کە باس لە دیاردەی مردن دەکات و هەموو ئەو دەوروبەرەی کە بەدیاردەکەوە لکاوە، جا زۆر جار یەکێك لەکەس و کاری مردووەکە چەند دێرە شیعرێك دەنووسێ و لەسەر گۆڕی مردووەکەیان تۆماری دەکەن یاخود لە دیوانی شاعیرێکەوە چەند دێرێك وەردەگرن یا وەك خۆی یا بەدەستکارییەوە لەسەر گۆڕەکە دەینووسن، جار وایە کەسی مردووەکە داوا لە شاعیرێك دەکەن کە چەند دێرە شیعرێك بۆ مردووەکەیان بنووسێت تا لەسەر گۆڕەکەی تۆماری بکەن هەر بۆ نموونە (ئەحمەد هەردی) شاعیر بۆ مەبەستی نووسین لەسەر گلکۆی ئازیزان چەندین چوارینەی نووسیوە کە تا ئێستاش شیعرەکانی لەسەر گۆڕەکان دەنووسرێتەوە هەروەها زۆر لە شاعیران شیعریان بەسەر کۆچکردنی دۆست و ئازیزانی خۆیاندا وتووە و لاواندنەوەیەکی زۆر هەیە بەسەر مردوودا کە زۆرجار دێرە شیعر لەو بەیتانەوە وەردەگرترێ و لەسەر گۆڕەکان دەنووسرێ، هەندێ جاریش مردووەکە خۆیی بەر لەمردنی شیعر دادەنێ بۆ سەر گۆڕەکەی و نموونەمان زۆرە (وەلی دێوانە) یەکێکە لەوانە وەسیەت دەکا و دەڵێ:

**بنووسن بەخوێن جەرگی سەرکردووم**
**کەمن بەتیری دەستی شەم مردووم**
**بەڵکو هەڵکەوێ لەراهـ گوزارێ**
**ڕێگەی بخاتە سەر گۆڕم جارێ**
**بزانێت کوشتەی دەستی خۆیەتی**
**لە خاکا مەیلی ڕەنگ و بۆیەتی**(٧٥).

دیارە دیاردەی مردن ئەوەندە کاری کردۆتە سەر لایەنی دەروونی مـرۆڤ تـا ڕادەیـی ئـەوەی هەست و سۆزی بوروژێنی و زۆرجار ئەو هەست و سۆزەیی بە شـیعر دەرخـستووە لەبـەر ئـەوە دەبینین لە ئیلهامی خۆیەوە شیعر بۆ کەسە ئازیزەکەی (مردووەکە) دەڵێ و لەسـەر گۆڕەکەیـدا تۆماری دەکات، بەهەر حاڵ ئەم دیاردەی نووسین لەسـەر گـۆڕە وەکـو نـەریتێکی لێ هـاتووەو زۆرکەس ئێستا لەسەر گۆڕەکان دەنووسن. ئەگەرچی نموونەی نووسین لەسەر گۆڕەکان زۆرەو هەر لەکۆنەوە ئەم دیاردەیە باو بووە، بۆ نموونە یەکێك لەو دەقە کۆنانە ئـەو دەقەیـە کـە (ئاشـوور بانیبال) لەسەر گۆڕی یەکێك لە پیاوەکانی خۆی نووسیویەتی و بەم شێوەیە کەوتۆتە بەر دەست (.... با خەڵکی هەموو واز لەوە بێنن بەخراپە دەسـت لـەو شـوێنە بـدەن، پیـاوێکی چـاك و ئازابوو، هەر کەسێك بێزاری بکات کە لەگۆڕدایە، پاشای گەورەی لەمە بێزار دەبێ بەزەیی بەو کەسە ناکات کە دەبێتە هۆی بێزاری)(٧٦).

دیارە ئەو نووسینانەی کە دەکرێ لەسەر گۆڕەکان بـەپێی سـەردەمەکە دەگـۆڕێ و شـێوەی نووسـینەکانیش لەگـەڵ بـارودۆخی سـەردەمەکەدا دەگـۆڕێ، بـۆ نموونـە لـە گۆڕسـتانەکانی کوردستانی باشوور گۆڕی کۆن هەیە کە بەزمانی عـەرەبی لەسـەری نووسـراوە دیـارە ئەمـەش بەهۆی دەسەڵاتی عەرەب بووە لەناوچەکەو زاڵبوونی ڕۆشنبیری عەرەبی لـەناو خـەڵکی، بـەڵام خۆش بەختانە ئێستا نووسینەکان زیاتر بە کـوردی تۆمـار دەکـرێ، جگـە لـەزمانی عـەرەبی سەردەمێك فارسی و تورکیش کاریگەری هەبوو لەسەر لایەنی ڕۆشـنبیری خەڵکەکـە، ئـەوەش بەهۆی ئەوەی کوردستان دابەشە لە نێوان عەرەب و فارس و تورك جـا بـەپێی دەسـەڵات هـەر خاکیان داگیر نەکردووە، بەڵکو سەردەمێك بەتەواوەتی لایەنی ڕۆشنبیریان داگیرکردبـوو، بـەڵام

(٧٥) دیوانی وەلی دێوانە، ل١٥.
(٧٦) گەڕان بەدوای نەمرییدا، ل١٠٢.



ئێستا بارودۆخەکە گۆڕاوەو ئاستی ڕۆشنبیری کوردی و بەکارهێنانی زمانی کوردی باشترە، جـا یەکێك لە نموونەکان کە بەعەرەبی و فارسی لەسەری نووسراوە گۆڕی (سلێمان) پاشای بابانە لـە گومەزی بابانەکان لە قەڵاچوڵان کە (یا مولکی ) لـەگۆڤاری ژیـن ژمـارە ١٨ نووسـینی سـەر هەدوو کێلەکەی نووسیوەو (عبدالرقیب یوسف)یـش ئـەو دەقـەی وەکـو چـۆن (یـا مـولکی ) نووسیوویەتی وەریگرتووەو دەقەکەش بریتییە لە:

**نووسینی کێلی پشت سەری:**

(هذه المشهد السعيد مرقد المأجور بالآخوة السيد الوالي العـالي البـاذل الحمـد لمصالح الانـام باني الحسنات الحد الاثار عليه في هذا الامور بالخروج.. مروري... وهو سليمان پاشا بن المرحـوم خالد پاشا عفر الله...)

نووسینی سەر کێلی بەر پێی بە فارسییە:

**والی عصر سليمان زمان**
**انکه کرد ستمر از دهر بروفت**
**وانکه تا چرخ بکامش کردید**
**کام خویش از همه اعداد بکرفت**
**اشکارا از چه بشغل دنیا**
**بود مشغول ولیکن بنهفت**
**اهتمامش همه دین دیندار بود**
**نه بکام دل خود خورد نەخفت**
**بود در عدل دین عالم گاق**
**باکفش یتخ سیاست هم چفتت**
**چند سالی که بدین قانون زیست**
**یافت تشریف شهادت رامفت**
**مفیدی هم مشتی با خنجر**
**کوهر جسم کرامیش بمفت**
**هه... چنان...** (٧٧).

(٧٧) قەڵاچوڵان یاپایتەختی میرنشینی بابان، عبدالرقیب یوسف، گ: هەزار مێرد، ٣: ١١ سـاڵی شەشـەم، سلێمانی، ساڵ ؟.

هەر وەكو وتمان بايەخدان بە نووسينى سەر گۆڕەكان زۆر لە مێژايە، بەڵام شێوەو مەبەستى نووسينەكان جۆراو جۆرە، نووسين هەيە لاواندنەوەيە، هەيە باسى فەلسەفەى ژيان و مردن دەكات هەيە ئامۆژگارييە... هتد. هەندێك لە نموونە جيهانێكانى ئيپيتاف ياخود نووسينى سەر گۆڕەكان ئەو نووسينانەيە كە لەسەر كێلى كەڵە نووسەرو هونەرمەندو كەسە بەناوبانگەكاندا هەيە بە نموونە هەندێكيان وەردەگرين تا ئاشنايەتى لەگەڵ شێوازى ئەو بابەتە نووسينانەش پەيا بكەين:

– وليم براون بۆ شاژنى بيمبرۆك دەنووسێ:

**لەژێر ئەم كفنە ڕەشەدا**
**مەنزڵگاى هەموو پەخشانەكانە**
**خوشكى سيدنى و دايكى بيمبرۆك**
**ئەى مردن: بەر لەوەى كەسێكى تر بەريت**
**جوان و خوێندەوار و باش بێت وەكو ئەو**
**ڕۆژگار بەتيرێك دەتپێكێ.**

– (داريدن)يش بۆ خێزانەكەى نووسيويەتى:

**لێرەدا خێزانەكەم نووستووە، بالێرە بمێنێتەوە**
**ئێستا ئەو ئاسوودەيە، هەروەها منيش**

جۆن يلموت ايرل لە رۆشستر- بۆ پاشا چارلزى دووەم:

**ئێرە دوا مەنزڵگاى پاشايەكى گەورەو بەڕێزە**
**كە هەرگيز پشت بە پەيمانەكانى نابەسترێت**
**و هەرگيز قسەى بێماناى نە كردووە**
**و هەرگيزيش قسەيەكى باشى نەوتووە**



– جۆنسون بۆ گۆڵد سميث دەنووسێ:

**بۆ ئۆليڤەر گۆڵد سميث، هۆنەرى رياليزم و مێژوونووس**
**ئەو كەسەى كە هەموو شێوازێكى نووسينى ئەزموون كردووە**
**و نزيك هيچ شتێك نەكەوتۆتەوە ئەگەر عاشقى نەبووبێت**[٧٨].

هەروەها يەكێك لە ئيپيتافە لاتينييە زۆر بەناوبانگەكان ئەو نووسينەيە كە لەسەر گۆڕێكى زۆر نووسراوەتەوە كە بريتييە لە:

(ئەمرۆ بۆ منەو سبەى بۆ تۆيە)، و هەر لەمەڕ نموونەكانى ئيپيتاف پارچەيەك وەردەگرين لەو نوسينەى كە لەسەر ئەم گۆڕانە تۆماركراوە:

– گۆڕى (وليم شكسپير):

**ئەى برادەرى زۆر خۆشەويست ئارام بگرە**
**لە دەردانى ئەو خۆڵەى لێرەدا زيندان كراوە**
**پايە بەرز بێت ئەو كەسەى ئەم بردانە دەپارێزێ**
**و نەفرەتى لێبێت هەر كەسێك ئێسكەكانم دەجوڵێنێ.**

– سروشت و ياساكانى سروشت
لە شەودا هێمن دەبێت
و خوا وتوويەتى- با نيوتن ببێت
جا ئەو ڕووناكييە بوو

لە گۆڕى (نيوتن)وە وەرگرتراوە، قەصيدەيەكى (الكساندر پۆپ)ە.

– ئەم گۆڕە هەموو شتێكى كوژراوى شاعێرێكى گەنجى ئينگليزى لەخۆ گرتووە.

ئەو كەسەى ويستى، لەگەڵ ئەوەى لەسەرە مەرگدا بوو
و دڵى زۆر تەنگ بوو
و هێزێكى دوژمنكارى دژايەتى دەكرد
ئەم وشانە لەسەر گۆڕەكەى بنەخشێنرێ

(٧٨) A Doctionary of Iitrary terms, page 237-238.

(ئێرە مەنزڵگای کەسێکە ناوی بە ئاو نووسرابوو)

-١٨٢١- February- 24 جۆن کیتس

– گۆڕی (بینیتو مۆسولینی) لەسەری نووسراوە:

ئێرە جێگای کەسێکە لە هەموو ئاژەڵەکانی سەر گۆی زەوی زیرەکترە.

– قەد لەدایك نەبوو، و هەرگیز نەمرد- بەڵام بە میوانی هاتە سەر هەسارەی زەوی لە نێوان ١٩٩٠,١٢,١٩ - ١٩٣١,١١,١١ (راجنیش)

– خوازیاری هیچ نیم و لە هیچیش ناترسم- چونکە سەربەستم (وەرگێڕاوە)- نیکۆس کازانتزاکیس

– ٣,١٤١٥٩٢٦٥٣٥٨٩٧٩٣٢٣٨٤٦٢٦٤٣٣٨٣٢٧٩٥٠٢٨٨

(لودلف فان کیولن)، زۆر بەداهێنانەکەی دڵ خۆش بوو هەستا بە ژماردنی (بای) (pi) ($\pi$) بو ٣٥ ژمارەو بڕیاریدا لەسەر گۆڕەکەی تۆمار بکرێت لە پاش مردنی[٧٩].

ئەوەی باسکرا چەند نموونەیەك بوو لەسەر ئیپیتافی جیهانی و دەمێنێتەوە باسی ئەوە بکەین کە زۆرجار شەڕو قوربانی دان بۆتە هۆی وروژاندنی هەست و سۆزی خەڵکی و لە ئەنجامدا چەندین دیاردەی لێکەوتۆتەوە بۆ نموونە ئیپیتافێکی تایبەتی هەیە بەناوی ئیپیتافی (کۆهیما) کە بۆ قوربانییەکانی جەنگی جیهانی دووەم نووسراوە و یەکێك لە نموونە زۆر بەناو بانگەکانی:

– کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ وڵات باسی ئێمەیان بۆ بکە

بڵێ: لەپێناوی سبەی ڕۆژیان، ئەمڕۆی خۆمان بەخشی[٨٠].

هەروەها ﴿ سیموندس لزیوس (٤٦٨-٥٥٦)﴾ چەند ئیپیتافێکی نووسیوە کە ناسراوە بە ڕەوانی و بەهێزی نووسینەکانی، نووسینێکی بە ناوبانگی هەیە بۆ سێسەت کوژراوەکەی شەڕی (ثیرمۆپیلای) نووسیوە، هەروەها یەکێك لە نەخشەکانی کە (سیموندس) کردوویەتی پێی دەوترێ (نەخش سیموندس لەسەر گۆڕی سپارتانییەکان) پاش مردنی لە شەڕی ثیرمۆپیلای کە دەکرێ لە کتێبی (مێژووی کارەکانی هیرودتس بۆ سپاراتانییەکان) بدۆزرێتەوە، دەقە ئەصڵییەکە بەڕەمزی لاتینی نووسراوە، بەڵام لەگەڵ پاراستنی مەتنی هۆنراوەکە دەکرێ

(٧٩) httpien.wikipedia.org/wiki/Eptaph#FamousEpitaphs

(٨٠) سەرچاوەی پێشوو.



ناوەڕۆکی شیعرەکە بەم شێوەیە وەربگێڕین: ئاە... ئەی بیانییەکان، بەلاسیدایمونییەکان بڵێین ئێمە لێرەین ئا لەم شوێنە، با یاساکان و نەریتەکانی ئێمە پەیڕەو بکەن... نەك یاساو نەریتەکانی خۆیان[٨١].

بەم شێوەیە کۆمەڵێك ئیپیتاف نووسرا بەهۆی شەڕو ناخۆشی نێوان وڵات و نەتەوە جیا جیاکان و ئەو نووسینانە بەشداری دەکەن لەگەڵ نووسینەکانی تر لە خوێندنەوەی مێژوو و هەروەها لە فراوانکردنی بواری نووسین لەسەر گۆڕەکان، دیارە لە گۆڕستانەکانی خۆشمان بەهۆی شەڕو ناخۆشی و کارەساتەکانی میللەتی کورد چەندین شیعر دەبینین کە لەناوەڕۆکیدا باس لەو نەهامەتیانە دەکات کە ئەو شەڕو شۆڕە بەسەر میللەتەکەدا هێناویە.

هەر لەبارەی ئەدەبی گۆڕستانەکان (نەورۆز فەرهاد) وتارێکی هەیە لە گۆڤاری (شین) ژمارە (١) بڵاوی کردۆتەوە کە تیایدا چەند نموونەیەکی شیعری سەر گۆڕەکانی وەرگرتووە لەسێ گۆڕستانی هەولێرەوە بۆ نموونە:

– جەنگ ئافاتە جەنگ ئافاتە

مەرگ دیاری دەسەڵاتە

شەهید عبدالواحید عثمان لە ١٩٩١/٣/٣١ شەهید کرا (قەبرستانی شێخ ئەحمەد- هەولێر)

– هێند سەربەستانە وەستای مەرگ ناچار پشتی پێ دای (شەهید فەرهاد عەلی حەسەن لە ١٩٥٨ لە دایکبووە، ١٩٩١/٣/٣١ شەهید کرا "قەبرستانی سەید مەعروف" هەولێر)

هەروەها لە درێژەی وتارەکەیدا باسی گۆڕستانی (ظهیر الدولة) دەکات لە تاران کە چەند گۆڕێکی هونەرمەندی لێیە لەوانە گۆڕی (فروغی فروغ زاد) جا دیواری گۆڕی ئەم خانمەش هەمووی خەڵکی نووسیویەتی بە شیعرو وشەی خۆشەویستی چونکە ئەم خانمە پایە بەرزە لایان و ڕێزی لێدەگرن[٨٢].

لە گۆڕستانەکانی کوردستان ئێستا ئایەت و شیعر نووسین لەسەر گۆڕەکان زۆر باوەو بەرێژەیەکی زۆر بەرچاو دەکەوێ کە لە بەشەکانی داهاتوودا بەوردی باسی دەکەین و لەبەر ئەوەی ڕێژەی ئەو شیعرانەی کە لەسەر گۆڕەکاندا هەیە یەکجار زۆرە، جێگای خۆیەتی بڵێین

(٨١) httpi//ww.m-w.com/dictionary/epigram.

(٨٢) ئەدەبی گۆڕستانەکان، نەورۆز فەرهاد، گ؛ شین، ژ١، دەزگای ئاراس، هەولێر، ئازادی- ٢٠٠٤.

ئەدەبێك هەیە تایبەتیە ئەویش ئەدەبی سەر گۆڕستانەكانە كە شیعرەكانی هەست و سۆزی خەڵكانێك دەردەبڕن بەرامبەر مردن و خۆشەویستی و ژیان... هتد. و زۆر لە مەبەست و هونەرە شیعریەكانیشی تیا دەدۆزرێتەوە، جا بۆیە شایەنی بایەخ پێدانەو هەر وەكو چۆن ئەو میللەتانەی تر ئیپیتافەكانی خۆیانیان كۆكردۆتەوە لەژێر ناوێكی تایبەتی و گرنگیان بەو لایەنە كەلتوورییەی خۆیان داوە پێویستە ئێمەش ئەو شیعرانەی لەسەر گۆڕەكان نووسراوە كۆیان بكەینەوەو تۆماریان بكەین تاكو نەفەوتێن و بپارێزرێن.

**هەندێك لەو ئایەتانەی لەسەر گۆڕستان بەرچاو دەكەون:**

ئاماژەمان بەوەكرد كە یەكێك لەو نووسینانەی لەسەر گۆڕەكان دەكرێ ئایەتە دیارە ئەو ئایەتانەش زۆربەی ئەو ئایەتە كورتانەیە كە باس لە دیاردەی مردن دەكات یاخود ژیان و نەمان و دوا ڕۆژو حیساب و كتاب و... هتد. ئەگەرچی لە ئایینی ئیسلامدا نووسین لەسەر گۆڕ یان هەڵگرتنی گۆڕ زۆر پەسەند نییە، تەنها دەكرێ بۆ ناسینەوەی گۆڕەكە نیشانەیەك دابنرێت یاخود ناوی مردووەكەی لەسەر بنووسرێت، هەروەها نووسینی شیعرو ئایەت لەسەر گۆڕەكان لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامدا باو نەبووە، بەڵام پاشان وردە وردە لەناو موسڵمانەكانیش نووسینی سەر كێلەكان پەیدابوو، ئێستا لەناو گۆڕستانەكان ئایەت بەزۆری دەنووسرێ لەسەر گۆڕەكان، و هەندێك جار لەسەر گۆڕێك دوو ئایەت یان زیاتر دەنووسرێت و بەزۆریش كۆمەڵێك ئایەتی دیار هەیە كە زۆر دووبارە دەبنەوە لەسەر گۆڕەكان، ئەمەش بەو واتایە نا كە تەنها ئەو ئایەتانە بنووسرێت، چونكە قورئانی پیرۆز ئایەتی زۆری تیادایەو هەر كەسێك بە ئارەزووی خۆیەتی كام ئایەت لەو ئایەتانە لەسەر گۆڕەكە تۆمار دەكات، بەڵام بەگشتی هەندێك ئایەت هەیە زۆر دەنووسرێ لەسەر گۆڕەكان و ئەو ئایەتانەش بەپێی ڕێژەی زۆر هاتنیان و دووبارەبوونەوەیان لەناو گۆڕستانەكانی كە ئێمە تیادا گەڕاین ڕیز دەكەین بەم شێوەیەی خوارەوە:



بسم الله الرحمن الرحيم

- (انا لله وانا اليه راجعون) (البقرة/ ١٥٧)
- (كل من عليها فان ◆ ويبقى وجه ربك ذو الجلال والاكرام ) (الرحمن/ ٢٦-٢٧)
- (كل نفس ذآئقة الموت ) (ال عمران/ ١٨٥).
- (ان وعد الله حق ) (الكهف/٢٢).
- (هذا ما وعد الرحمن وصدق المرسلون) (يس/ ٥٢)
- (وما تدرى نفس ماذا تكسب غداً وما تدري نفس بأي ارض تموت) (لقمان/ ٣٤).
- (ان الساعة اتية لا ريب فيها ) (المؤمن/ ٥٩)
- (ياايتها النفس المطمئنة ◆ ارجعي الى ربك راضية مرضيةً) (الفجر/ ٢٧-٢٨)
- (الا بذكر الله تطمئن القلوب)
- (قل لن يصبنا الا ما كتب الله لنا) (التوبة/ ٥١)
- (لكل اجل كتاب)
- (قل هو الله احد ◆ الله الصمد ◆ لم يلدو ولم يولد ◆ ولم يكن كفواحد) (الاخلاص/١-٤)
- (اينما تكونوا يدرككم الموت ولو كنتم في بروج مشيدة) (النساء / ٧٨).
- (واعبد ربك حتى يا تيك اليقين) (الحجر/ ٩٩)
- (فأما إن كان من المقربين ◆ فروح و ريحان وجنت نعيم) (الواقعة/ ٨٨-٨٩)

(سورة الفاتحة) و (اية الكارسى)

**(صدق الله العظيم)**

پاشان ئەو گۆڕانەی کە شەهیدە زۆربەی زۆری ئایەتی (ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله امواتا بل احيا و عند ربهم يرزقون) (آل عمران/٦٩) لەسەر نووسراوە جگە لەئایەت و شیعری تریش.

هەندێك جار فەرموودەكانی پێغەمبەر (د.خ) وەكو ئایەتەكان لەسەر گۆڕەكان دەنووسرێ، بۆ نموونە زۆرجار ئەو گۆڕانەی كە هی ئافرەت و بەتایبەتی ئەگەر دایك بووبێت لەسەری نووسراوە (الجنة تحت اقدام الامهات).

و جگە لەو ئایەتانەی كە باسمانكرد كۆمەڵێك ئایەتی تر هەیە كە زۆر دووبارە نابێتەوە و تاكە تاكە لەسەر گۆڕەكان نووسراوە و لە درێژەی باسەكەدا هەندێك لەو نموونانەش دەخەینە ڕوو.

لە هەر گۆڕستانێك كە گەڕاین هەوڵماندا جۆرە ژماردنێك بكەین بۆ ئەو ئایەتانەی کە زۆر نووسراون لەسەر گۆڕەكان ئەگەرچی ئەو ژماردنە سەت لەسەت تەواو نییە چونكە ژمارەی گۆڕەكان یەكجار زۆرن، بەڵام تا ڕادەیەك و بەپێی توانا هەوڵماندا ئامارێكی ورد بكەین بۆ ئەم نووسینانە و ئەنجامەكانیشی بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

لە گۆڕستانی (چراغ)ی هەولێر ئەو ئایەتانەی كە بەڕادەیەكی زۆرتر تۆماركراون ئایەتی (كل نفس ذائقة الموت) (آل عمران/١٨٥)و ئایەتی (كل من عليها فان) (الرحمن/٢٦) پاشان (وما تدري نفس ماذا تكسب غداً وما تدري نفس باي ارض تموت) (لقمان/٣٤) ئەو سێ ئایەتە زۆر دووبارە دەبوونەوە پاشان ئایەتەكانی تر بەرێژەی كەم تر. لە گۆڕستانی (شێخ محی الدین)ی كەركووكیش ئەو ئایەتانەی كە زۆر دووبارە دەبنەوە ئایەتی (انا لله وانا واليه راجعون) (البقرة/ ١٥٧) و (كل نفس ذائقة الموت) (آل عمران/ ١٨٥)، (ان وعد الله حق) (الكهف/ ٢١)و (الا بذكر الله تطمئن القلوب) (        )، (ان الساعة اتيه لاريب فيها) (المؤمن/ ٥٩)، (وما تدري نفس ماذا تكسب غداً وما تدري نفس باي ارض تموت) (لقمان/ ٣٤)و... هتد. پاشان ئایەتەكانی تر دێن.

لە گۆڕستانی (شاخكی) لە دهۆك هاتنی ئایەتەكانی بەم شێوەیە بوو:

(انا لله وانا واليه راجعون) (البقرة/ ١٥٧) پاشان (كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذو الجلال والاكرام) (الرحمن/ ٢٦-٢٧)، (كل نفس ذائقة الموت) (آل عمران/ ١٨٥)، (هذا ما وعد الرحمن وصدق المرسلون) (يس/ ٥٢)، (يا ايتها النفس المطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية) (الفجر/ ٢٨/٢٧)... هتد و زۆربەی



گۆڕەكانی گۆڕستانی شاخكی لەسەر كێلەكەیان (انالله وانا اليه راجعون) نووسراوە جگە لە ئایەتەكانی تر.

لە گۆڕستانی (سەیوان) لە سلێمانی ئایەتەكانی بەپێی زۆر دووبارەبوونەوەیان بەم شێوەیە بوو: (كل من عليها فان) (الرحمن/ ٢٦)، (كل نفس ذائقة الموت) (آل عمران/ ١٨٥)، (ان وعد الله حق) (الكهف/ ٢١) و (هذا ما وعد الرحمن وصدق المرسلون) (يس/ ٥٢)، (انا لله وانا واليه راجعون) (البقرة/ ١٥٧) و (يا ايتها النفس المطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية) (الفجر/ ٢٨/٢٧)...

ئێمە ئەگەر لەتەواوی گۆڕستانەكان بگەڕێین ناتوانین هیچ ڕێژەیەكی تەواو بدەین بەدەستەوە، چونكە گۆڕ هەیە دوو ئایەتی لەسەر تۆماركراوە یان زۆرتر ئەمە جگە لە ژمارە زۆری گۆڕەكان، جا لەبەر ئەوەی زۆر دووبارە دەبێتەوە ئامارێكی تەواومان بۆ ناكرێت، بەڵام ئەوەی لەسەرەوە باسمان كرد لەڕێی ئەو ئەنجامانەوە دەستمان كەوت كە لەكاتی گەڕان بە ناو گۆڕستانەكاندا تۆمارمان كردبوو و هەروەها بەپێی ئەو نموونانەی كە نووسیومانەتەوە لەسەر گۆڕەكان.

دەمێنێتەوە ئاماژە بەوە بكەین كە زۆرجار لەسەر گۆڕی مەلا یاخود پیاوانی ئاین یان شەهیدەكان سوورەتی بچووكیان بۆدەنووسرێ سوورەتەكانیش بەزۆری سوورەتی (الفاتحة)و (إخلاص)و (كوثر).. هتد لە سوورەتە بچووكەكانی قورئان.

## هەندێک لە نموونەی
## ئەو گۆڕانەی کە ئایەتیان لەسەر تۆمار کراوە

**لە گۆڕستانی (چراغ) هەولێر:**

- گۆڕی خوا لێخۆشبوو (صبیحة عبداللە اسماعیل) (١٩٤٠-٢٠٠٠) لەسەر کێلەکەی (هذا ما وعد الرحمن و صدق المرسلون) (یس/٥٢) و لەسەر تەنیشتی گۆڕەکە لەلای ڕاست: (اذا الشمس كورت◆ واذا النجوم انكدرت ◆ واذا الجبال سيرت ◆ واذا العشار عطلت◆ واذا الوحوش حشرت) (التكوير/ ١-٥)

لای چەپ/ (واذا البحار سجرت ◆ واذا النفوس زوجت ◆ واذا الموءدة سئلت◆ بأي ذنب قتلت) (التكوير/ ٦-٩)

- حاجی (لعلی سلێمان محمد) لە (٦٩) لەدایك بووەو لە (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.

لەسەر کێلەکەی بەرپێی (ان الينا ايابهم ◆ ثم ان علينا حسابهم) (الغاشيە/ ٢٥-٢٦)

لە تەنیشتی چەپی (قل هو الذي ذراكم في الارض واليه تحشرون) (الملك/ ٣٤)

- (ربيعه عبداللە علی) لە (١٩٩٩) کۆچی کردووە

لەسەر کێلەکەی (وان ليس للانسن الا ماسعى) (النجم/ ٣٩)

- هۆگر شێرزاد عبداللە

لەسەر کێلەکەی (كل نفس ذائقة الموت ثم الينا ترجعون) (آل عمران/ ١٨٥) لە تەنیشتی ڕاستی (نحن نقص عليك نبأهم بالحق انهم فتية امنوا بربهم وزدنهم هدى) (الكهف/ ١٣)

لای چەپ (الى مرجعكم وهو على كل شي و قدير) (الهود/ ٤)

- (عمر خەزنەدار) (١٩٣١- ٢٠٠٤) کێلەکەی بەر پێی (يوم لاينفع مال ولا بنون الا من اتى الله بقلب سليم) (الشعراء/ ٨٨- ٨٩)

تەنیشتی چەپی: (وجعلنا من بين ايديهم سداً ومن خلفهم سداً فأغشينهم فهم لا يبصرون) (يس/٩)

تەنیشتی ڕاست: (قل ان الاولين والاخرين◆ لمجموعون الى ميقت يوم معلوم) (الواقعه/ ٤٩-٥٠)

- (فقى عزيز محمد) المتوفي في عيد الاضحى المبارك



لەسەر کێلەکەی لای پێی (قل هو الله احد ◆ الله الصمد◆ لم يلد ولم يولد◆ ولم يكن له كفواً احد) (الاخلاص/ ١-٤)

- فەیرۆز حسين عزيز ١٩٥٢/٧/١- ٢٠٠٣/٨/٢

کێلەکەی بەر پێی (وما كان لنفس ان تموت الا بإذن الله كتباً مؤجلاً) (آل عمران/١٤٥)

**لە گۆڕستانی شێخ محی الدين- کەرکووک:**

- ابراهيم توفيق محمد (١٩٨٢) کۆچی دوایی کردووە

لەسەر کێلەکە (هذا ماكنت منه تحيد)

لەتەنیشتی (وجاء ت سكرة الموت بالحق ذلك يوم الوعيد)، بەڵام ئەم ئایەتە بە هەڵە نووسراوەو ڕاستەکەی بەم شێوەیە یە (وجا وت سكرة الموت بالحق ذلك ما كنت منه تحيد◆ ونفخ في الصور ذلك يوم الوعيد) (ق/١٩-٢٠)

- سيد سعيد سيد احمد الشيخاني- توفى (١٩٩٨)

لەسەر کێلەکە لای سەری لە دیوی ناوەوە نووسراوە

(الحمدلله الذي لا يبقى الا وجهه ولا يدوم الا ملكه وكل شي ها لك الا وجهه له الحكم واليه ترجعون) ئەمەیان ئایەت نییە یان فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) یان دوعایە.

- جلال عبدالواحد کۆیی ١٩٢٦- ١٩٩٠

لەسەر کێلەکە نووسراوە (يا ارحم الراحمين ارحمنا) و

(والسلم على يوم ولدت ويوم اموت ويوم ابعث حياً) (مريم/ ٣٣)

لە تەنیشتەکەی (ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله امواتا بل احيا و عند ربهم يرزقون) (آل عمران/ ١٦٩)

- خانم قادر حسن لە ١٩٩٢ ز کۆچی کردووە.

لای ڕاستی گۆڕەکەی نووسراوە (ولمن خاف مقام ربه جنتان ◆ فأي الا و ربكما تكذبان) (الرحمن/٤٦-٤٧).

- غفوره خيريه توفيق لە ١٣٨٨هـ کۆچی کردووە.

لەسەر کێلەکە (رب اشرح لي صدري ◆ ويسرلي امرى ◆ واحلل عقدةً من لساني ◆ يفقهوا قولي) (طه/ ٢٥-٢٨)

- عبدالخالق احمد قادر (١٩٤٩ — ١٩٩٦)

لە تەنیشتی چەپی: (انما امره اذا اراد شيئاً ان يقول له كن فيكون) (يس/ ٨٢)

لای ڕاست: (یا ایتها النفس المتطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضيةً) (الفجر/ ٢٧-٢٨)

– صهيب امين غريب توفى فى (٢٠٠٠)

تەنیشتی ڕاست (ما اصاب من مصيبة الا بإذن الله ومن يؤمن بالله يهد قلبه والله بكل شيء عليم) (التغابن/ ١١)

چەپ: (كل شيء هالك الا وجهه له الحكم واليه ترجعون) (القصص/ ٨٨)

**لە گۆڕستانی سەیوان سلێمانی:**

– حاجی مەلا صالح کەریم لە ١٩٨٨ لە تەمەنی ٨٥ساڵیدا کۆچی کرد لە تەنیشتەکان دوعایەك نووسرابوو.

(اعوذ بك من شر ماصنعت وابوء لك بذنبي وابوء لك بنعمتك على، ربنا واتنا ما وعدتنا على رسلك ولا تخزنا يوم القيامة انك لا تخلف الميعاد) و لەسەر کێلەکەی لای پێی (الا بذكر الله تطمئن القلوب)

– عثمان حاجی عبداللە- ١٩٩٢ کۆچی کردووە

لەسەر کێلەکە (ان وعدالله حق وان الساعة اتية لاريب فيها) (المؤمن/ ٥٩)

لە تەنیشتی (فسبحن الذي بيده ملكوت كل شي و اليه ترجعون) (يس/ ١٨٣)

– (شێخ محمد خاڵ) (١٩٠٤-١٥/ تەموزی ١٩٨٩) کۆچی کرد لەسەر گۆڕەکەی ئەم ئایەتانە نوسراوە.

(كل من عليها فان) (الرحمن/ ٢٦)

(يا ايها النفس المتطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية) (الفجر/ ٢٧-٢٨) (كل نفس ذائقة الموت) (آل عمران/ ١٨٥)

**لە گۆڕستانی شاخکی دهۆك:**

– مجید عمر ربتکی ١٩٣٥- ١٩٨٧، شڤان مجید ربتکی (١٩٧٩- ١٩٨٧) بەکارەساتی ئۆتۆمبێل کۆچیان کردووە، لەسەر گۆڕەکانیان نووسراوە (كل نفس ذائقة الموت) (آل عمران/ ١٨٥) (الذين توفاهم الملائكة طيبين يقولون سلام عليكم ادخلوا الجنة بما كنتم تعملون) (النحل/ ٣٢)

– احمد یاسین البناء (١٩٢٧- ١٩٨٠)

لەسەر کێلی بەرپێی (يا ايها النفس المتطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية) (الفجر/ ٢-٢٨)



تەنیشتی ڕاستی/ (كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذو الجلال والاكرام) (الرحمن/ ٢٧-٢٨)

چەپ/ (ان الله يغفر الذنوب جميعاً انه هو الغفور الرحيم) (الزمر/ ٥٢)

– ابراهیم علی مصطفی- (١٩٥٠- ١٩٨٧)

(كل من عليهافان) (الرحمن/ ٢٦)

و(قل لن يصيبنا الا ماكتب الله لنا وهو مولنا وعلى الله فليتوكل المؤمنون) (التوبه/٥١)

* **تێبینی**/ زۆربەی ئەو مردووانەی کە بەکارەسات مردوونە لەسەر گۆڕەکانیان ئایەتی (قل لن يصبنا الا ماكتب الله لنا) (التوبة/ ٥١) نووسراوە.

– المحامی الشاب احمد سعید صالح (الطائي) (١٩٧٨-٢٠٠٥)

لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە:

(طه♦ ما انزلنا عليك القر وان لتشقى♦ الا تذكرة لمن يخشى ♦ تنزيلاً ممن خلق الارض والسموات العلى ♦ الرحمن على العرش استوى ) (طه/ ١-٥)

– هیلان وصف الدین حسن الدوسکی (٩٩٣- ١٩٩٩)

تەنیشتی ڕاستی (تبرك الذي بيده الملك وهو على كل شي و قدير ♦ الذي خلق الموت والحيوة ليبلوكم ايكم احسن عملاً وهو العزيز الغفور) (الملك/ ١-٢)

چەپ/ (يس ♦ والقران الحكيم ♦ انك لمن المرسلين ♦ على صراط مستقيم) (يس/ ١-٢)

– الفنان الكردی المرحوم (محمد عارف جزیری) (١٩١٢- ١٩٨٦)

تەنیشتی ڕاست (الذين توفاهم الملائكة طيبين يقولون سلام عليكم ادخلوا الجنة بما كنتم تعملون) (النحل/ ٣٢)

چەپ: (وما جعلنا لبشر من قبلك الخلداً أفإن مت فهم الخالدون) (الانبياء/٣٤)

ئەو نموونانەی کە باسکرا زۆر کەمن بە بەراوردکردنی لەگەڵ هەموو گۆڕە نووسراوەکان، بەڵام بە گشتی ئەو نموونانە هەندێك نموونەی هەڵبژێردراوبوو لە نێوانیان.

دیارە نووسینی ئایەت یا فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) یان دوعا لەسەر گۆڕەکان بۆ پیرۆزییەکەی دەگەڕێتەوە، و خەڵك لەو باوەڕەدان کە مرۆڤ پاش مردن تەنها خێرکردن و قورئان خوێندن بە کەڵکی دێ و دەگاتە هانای هەر لەبەر ئەوەیە دەبینین لەسەر قەبران قورئان دەخوێنرێ و ئایەتەکانی قورئانیش لەسەر گۆڕەکان دەنووسرێت.

### ئەدەبی سەر گۆڕەکان:

یەکێك لەو ئەرکانەی کە بۆ ئەدەب دەستنیشان کراوە مەسەلەی پڕکردنەوەی دەروونییە (التعويض النفسي)، واتە ئەدەب لە شێوەیەکیدا هەوڵیداوە ئەو کەلێنە پڕ بکاتەوە کە لەناخی مرۆڤدا دروست بووە، مردنیش یەکێکە لەو دیاردانەی کە ناخۆشی و نەهامییەتییەکی زۆری لەگەڵ خۆیدا بۆ مرۆڤ هێناوە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو مردنە هۆیەکی لە پشتەوە بێت، واتە مردنێکی کارەساتاوی بێت شەهید بوون، مردن بە نەخۆشی، ڕوودایی دڵ تەزێن کە زۆر جاریش گەنج بۆتە خۆراکی ئەم ڕوودانە، جا بێگومان ئەو مردووە کۆمەڵێك ئاواتی هەبووەو جێی هێشتوون و کۆمەڵێك کەسی تری بەجێ هێشتووە لەژیاندا پاش خۆی.. هتد. خوی مردنیش هەر دابڕانە جا ئەگەر پیر بێت یا گەنج بێ مردووەکە، لەبەر ئەوە هەوڵدراوە ئەو ناخۆشییەی کە ئەوە دابڕانە دەیهێنێت بە شێوەیەك تەعبیری لێ بکرێت و باسی بکرێت ئەو شێوەیەش لە شیعردا خۆی نواند و شیعربوو بە دڵدانەوەیەك بۆ خەمەکانی مرۆڤ.

سەرەتا کە نووسین کرا لەسەر گۆڕەکان دوو دێرە شیعر بوو گریکەکان تۆماریان دەکرد لەسەر گۆڕەکانیان کە باسی لە فەلسەفەی ژیان و مردن دەکرد یاخود وەسفێکی کەسە مردووەکە بوو پیاهەڵدان یان داشۆرین یاخود بەرزکردنەوەی پلەو پایەی مردووەکە بوو پاشان شیعری شین و لاواندنەوەو گریان هاتە پاڵی، بەڵام ئێستا لە گۆڕستانەکان و بەتایبەتی ئەو گۆڕستانانەی کە لەسنووری کارەکەی ئێمەدا بوو کۆمەڵێ مەبەستی شیعری جیاواز دەدۆزینەوە لە نێو ئەو شیعرانەی کە لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراون دیارە بوونی هەر مەبەستێکیش لە شیعرەکاندا پەیوەندی بە واقیعی ژیانی میللەتی کوردەوە هەیە. بۆ نموونە زۆرجار شیعری نیشتمان پەروەری لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە دیارە ئەوەش لەبەر نەبوونی نیشتمانێکی سەربەخۆیەو هەروەها بەردەوامی ململانێ لە نێوان گەلی کوردو وڵاتانی داگیرکەر هۆیەکی ترە کە شەڕو زوڵم و ناخۆشییەکەی زۆری لێ کەوتۆتەوەو بۆتە هۆی شەهیدبوونی هەزاران کەس لە پێناوی خاك و میللەت، جا لەبەر ئەوە دەبینین شیعری نیشتمان پەروەری بەزۆری لەسەر گۆڕەکان دەنووسرێ کە باس لە خۆشەویستی وڵات دەکات یاخود باس لە ئازایەتی و گیان فیدایی کەسە مردووەکە دەکات بەرامبەر بەنەتەوەو خاکەکەی.

جگە لەو زنجیرە کارەساتەی کەبەسەر میللەتی کوردا هاتووە. کوردەکانی کوردستانی باشوور بەشداری شەڕەکانی عێراقیانیش کردووە کە لەگەڵ دراوسێکانی کردوویەتی لەوێش قوربانییەکی زۆری داوە. جا ژمارەی شەهیدەکان یەکجار زۆرە لەبەر ئەوەش دەبینین لە نێوانی



ئەو نووسینانەی لەسەر گۆڕەکان کراوە لاواندنەوەی دایکی شەهیدە بۆ کۆڕە جوانەمەرگەکەی، یاخود منداڵ بۆ باوکی یا وەسێتی شەهیدەکە بۆ کەس و کارەکەی لەسەر گۆڕەکان بە شیعر نووسراوە، هەروەها هەیە دەزگیرانی بەجێ هێشتووە یاخود تازە زاوا بووە، منداڵی وردی لەپاش بەجێ ماوە... هتد. ئەم ڕووداوانە هەمووی بە شیعر باسی کراوەو لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە. ئەگەر شەهیدەکە ئافرەتیش بێ بەهەمان شێوە شیعری بۆ نووسراوە کە باس لەکارەساتەکەی بکات.

لەلایەکی ترەوە ئەو مردووانەی کە بەنەخۆشی مردوون یان بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل بە شێوەیەکی تر شیعریان بۆ دەنووسرێت، زۆرجار باسی ئاواتی مردووەکە دەکات یان باسی نەهامەتییەکانی کەسەکە دەکات لەکاتی نەخۆشییەکەی و باس لە دەرمان کردن و دکتۆر دەکات.

زۆرجاریش شیعر لەسەر گۆڕەکان نووسراوە کە پەیمان بەمردووەکە دەدات تۆڵەی بسەنرێتەوە لە دوژمن یا لەکەسی ناحەز کە بۆتە هۆی مردنی کەسەکە، زیاتریش ئەم جۆرە نووسینانە لەسەر گۆڕی ئەو مردووانە دەبێت کە کوژراون جا لەشەڕ دابێت یاخود بەهۆی کێشەیەکی کۆمەڵایەتییەوە بێت.

دیارە مەبەستی تر بۆ ئەو شیعرانەی کە نووسراون لەسەر گۆڕەکان زۆرەو بەگشتی ڕەخنەگرتنە لەدیاردەی مردن یاخود باسی فەلسەفەی ژیان و مردنە یا پیاهەڵدانە، وەسفکردنە، لاواندنەوەیە...هتد. و لەمیانی ئەو نموونانەی کە باسی دەکەین زیاتر مەبەستەکانمان بۆ ڕوون دەبێتەوەو ئەگەر پێویست بکات هەر چ تێبینییەك هەبێت لەگەڵ نموونەکاندا دەیخەینە ڕوو.

لە گۆڕستانەکانی باشووری کوردستان جگە لە نووسین بەزمانی کوردی بەعەرەبیش نووسین کراوەو شیعری عەرەبیش لەسەر گۆڕی کوردەکان نووسراوە. بەڵام وەکو پێشتر ئاماژەمان پێی کرد ئێستا نووسین لەسەر گۆڕەکان زیاتر بە کوردییە. جگە لەوەش لە گۆڕستانی (شاخکی) لە دهۆك چەند گۆڕێکمان بەرچاو کەوت کە بە کوردی لەسەری نووسراوە، بەڵام بە پیتی لاتینی.

بەگشتی گۆڕستان هەست و سۆزێکی تایبەتی دەوروژێنێ لەلای مرۆڤ دەیگەڕێنێتەوە بۆ ناو جیهانی خەیاڵ و بیرکردنەوە لەو دیاردە نامۆیە کە مردنە. گۆڕستانەکانی کوردستانیش زیاتر هەست و سۆز دەبزوێنن و دەتبەنە ناو جیهانێکی دیکەوە پڕ لە ناخۆشی و پرسیار و بەزەیی، چونکە کارەساتێکی زۆر تۆمارکراوە لەسەر گۆڕەکان و شیعری دڵتەزێن کە باس لە ڕووداوە پڕ نەهامەتییەکانی ژیانی میللەتی کورد دەکات. دیارە نووسینی ئەو شیعرانەش بارودۆخ و توانایەکی تایبەتی دەوێ لە کەسی نووسەر تاکو بتوانێ بە جوانترین شێوە ئەو سۆز و

هەستانەی مرۆڤ بخاتە سەر کاغەزو پاشان بۆ سەر کێلەکان. جا لەبەر گرنگی ئەو لایەنە ئەدەبییەی کە ناوی ئەدەبی گۆڕستانە بە پێویستی دەزانم کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوە بۆ ئەو شیعرانە بکرێت کە لەسەر گۆڕەکان دەنووسرێن کە زۆر بەشی خەڵکی سادە نووسیویەتی و دەربڕینی ناخ و دەروونی ئەوانە.

دیارە ئەو شیعرانەی کە لەسەر گۆڕەکان نووسراون فەرامۆشی لایەنە جوانکارییەکەی نەکراوە لەبەر ئەوە دەبینین وشەی جوان بەکارهاتووە و ڕەچاوی کێش کراوە لە هەندێك دێردا هەروەها ئەگەر شیعرەکە ئازادیش بێت هەوڵدراوە بە زمانێکی جوان بنووسرێت ئەمە جگە لەوەی هەندێك لەو دێرە نووسراوانەی سەر گۆڕ هەر لە بنەڕەتا خۆی هی شاعیری پایە بەرزەو لە دیوانە شیعرییەکانەوە وەرگرتراوە.

هەروەها تۆمارکردنی ئەم شیعرانە بایەخێکی تری هەیە ئەویش لایەنە ڕۆشنبیرییەکەیە واتە لەڕێی ئەم شیعرانەوە دەتوانین لایەنی ڕۆشنبیری و چۆنیەتی بیرکردنەوەی میللەت دەستنیشان بکەین، ئەو شیعرانەش کە ئەمڕۆ لەسەر گۆڕەکان دەنووسرێت و ئێستا وەکو نەریتێکی لێ هاتووەو خەڵکی زۆر پەیڕەویی دەکات سبەی ڕۆژ دەبێتە مێژوو و دەچێتە ناو مێژوویی ئەدەبیاتی میللەتەوە چونکە بمانەوێ و نەمانەوێ ئەم شیعرانە فۆڕم و ناوەڕۆکی تایبەتی بە خۆوە هەیەو ژمارەی شیعرەکانیش یەك و دوو نییە تا پشتگوێ بخرێت، چونکە هەر گۆڕستانێك بگەڕێیت بایی دیوانێك شیعر دەدۆزیتەوە جا لەبەر ئەوەی ئەم لایەنەمان پێ گرنگە هەوڵدەدەین کۆمەڵێك لەو شیعرانەی کە وەرمانگرتوون لە گۆڕستانەکانەوە بخەینە ڕوو و بەپێی پێویستیش تێبینییەکان بنووسین و ئەم نموونانەی کە باسی دەکەین لە چوار چێوەی سنووری کارەکەمانەوە وەرگرتراون. جا ئێستا هەر گۆڕستانێك بەجیا وەردەگرین:

هەر وەك وتمان بۆ ئەم کارە ئێمە چوار گۆڕستانی چوار پارێزگای باشووری کوردستانی وەرگرت تاکو لەم ڕووەوە شارەزای لایەنی ڕۆشنبیری هەر چوار پارێزگاکەبین و لەبەر ئەوەی ئێمە بە شێوەیەکی گشتی دەڵێین (ئەدەبی گۆڕستان) بە پێویستمان زانی گۆڕستانەکان لە چوار شاری جیاوازەوەبن تا هیچ لایەك فەرامۆش نەکرێ و لەکاتی هەڵبژاردنی گۆڕستانەکان هەوڵماندا گۆڕستانی بەناو بانگی شارەکە وەربگرین هەروەها بایەخمان بەوەدا کە لەڕووی مێژووییەوە ئەو گۆڕستانانەی وەریدەگرین کۆن بێت، جگە لەوە ئێمە دەزانین کە لەسەر گۆڕەکان شیعر و ئایەت دەنووسرێ بە یەکەوە، بەڵام لەم بەشەدا تەنها بایەخ بە شیعرەکان دەدەین و ئایەتەکانیش پێشتر لەسەری دواین.



## نموونەی شیعر و نووسین لەسەر کێلی گۆڕستانەکان

### گۆڕستانی دهۆك:

لە دهۆکەوە دەست پێ دەکەین، چونکە کەمترین نموونەمان لە دهۆکەوە دەست کەوت. لەبەر ئەوەی لەوێ نووسینی شیعر لەسەر گۆڕەکان باو نییەو تەنها ناو وساڵی کۆچ کردنەکە دەنووسرێت و هەندێك جار لەگەڵ ئایەتێك. بەهەر حاڵ وەکو لەبەشی دووەمدا باسمانکرد سەرەتا لە دهۆك چوینە ناو گۆڕستانێك کە دەکەوتە محلا قەرجاو لەناو بازاڕی دهۆکەو گۆڕستانێکی زۆر کۆنەو هەر ئەوتە ئاساری گۆڕەکانی تیادا دەبنیرا، جا لەوێ یەك نموونەمان وەرگرت لەسەر گۆڕی مەلا یەك کە دیوارێکی بەرز بۆ گۆڕەکەی دروست کرا بوو بۆیە نووسینەکەی لەسەرمابوو و نووسینەکەش بەزمانی عەرەبی بوو:

- العالم الفاضل الملا محمد سعيد بن الملا يسين ابن الشيخ (١٨٩٧- ١٩٧٦) نووسینەکە بریتی بوو لە:

| | |
|---|---|
| **هو الله الحي وهو باق** | **يغير ولا تغيره العصور** |
| **نبي احمد هاد رسول** | **رسول الله بل عبد شكور** |
| **لمثواى الاخير اتيت ارجو** | **المغفرة ويعفونا الغفور** |
| **ولولا عفوه المرجو فينا** | **.... بضاعتنا قصور** |
| **سوى لفظاً الشهادة في لساني** | **الا الله في قلبي يدور** |
| **فحسبي هذه حسيي وحسبي** | **لأنني مسلم ربي الغفور** |
| **لرحمته بباب قد نزلنا** | **مضاجعنا ومثوانا القبور** |
| **الا ياعابر  فينا لتقرأ** | **بفاتحة ويتلوها المرور.** |

پاشان چوینە گۆڕستانی شاخکی کە تۆزی لە دهۆك دەردەچی بەرەو ڕۆژئاوا، گۆڕستانی گەورەی شاری دهۆکە و ژمارەیەکی زۆر گۆڕی تیادایە، بەڵام شیعر زۆر بە کەمی لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە دیارە ئەوەش پەیوەندی بەلایەنی نەریت و ڕۆشنبیری ئەوێوە هەیە، زیاتر ئایەت لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە یاخود تەنها ناوی مردووەکە و ساڵی لە دایکبوون و

كۆچكردنی. بەگشتی ئەو شیعر و نووسینانەی کە بەرچاومان کـەوت لـە تـەواوی گۆڕسـتانەکە ئەمانەی خوارەوە بوو:

– شەهیدی نەمر (مامەند کمال باجلوری)/ ئەندامی کۆمیتا دهۆکی (ی.ن.ك) لـە ڕۆژا ١٩٩١/٨/٢١ ل دهۆك شەهید کرا.

لەسەر کێلی بەرپێی:

| | |
|---|---|
| **شین و تازیا شەهیدا ئەم** | **ژبیر ناکەین چ جار** |
| **دێ ڤەکەین تولانە هنگا** | **وەختەکێ ژبیرین بژار** |

- خنساء کـورد (دەیکـا حـەلیما) دەیکـا هـەر چـار شـەهیدێن (پـشتاگری) (١٩٣٧) هاتە سەر دنیایێ و (١٩٩٧) چویە بەر دلۆڤانیا خودێ لەلای ڕاستی گۆڕەکە: **ئـەزێ دنالم بوتە دایێ**

| | |
|---|---|
| **دەیکا حلیم دەیکا کوردا** | **سەر بلندا لناڤ مەردا** |

**لای چەپ/ پشتا گری ئەڤرو تازەیە**

| | |
|---|---|
| **ئەف شێرە دەیکە هەرا بخوزیە** | **بۆ سەرکەفتنێ چەند بهێڤیە** |

– ئەڤە گۆڕێ بلومایێ خەباتکارا (**محمد** سعید دوسکی)یە
**١٩٢٦** ل گوندی گەرماڤایێ هاتییە دنیایێ
و ل **١٩٩٣** ل واشنطن چووە بەردلوڤانیا خودێ
لەسەر کێلەکە:

**حەیفە ئەڤرۆ عومر و ژی کو بۆری کوردستانا من**
**دەردەمەندو دەربەدەر چوو دوری کوردستانا من**
**تێر ب ئازادی ژیا بام ژێری کوردستانا من**
**یان مرنا ب غەریبی ئەز ل خاکا تە ولات**
**بیمە مێڤان و حەواندی و گوڕی کوردستانا من**
**بیمە شوشتین ئەز ب ئاڤاتەی شیرین و عەنبەرین**
**کفنی من بزەر و کەسك و سووری کوردستانا من**



* دیارە بەسەرهاتەکانی کورد، کوردەکانی پەرتەوازەکرد بەناو وڵاتانی جیهـان و ئەمـەش وای کردووە کە مردیشن بەهیوای ناشتنیان بن لـەخاکی وڵاتەکـەی خۆیـان نـەك لـە غـەریبی ئەمەش لە شـیعرەکەدا بەدەردەکـەوێ هـەروەها زۆرجـار لەسـەر گۆڕەکـان شـوێنی مردنەکـە دەستنیشان دەکرێ بەتایبەتی ئەگەر لەو شارە نەبووبێت کە گۆڕستانەکەی تیادا بێ.

– زلیخە **محمد** حسین (١٩٥٠- ٢٠٠٤)

لەسەر کێلەکەی نوسراوە: **ژینا بێ دایك تارییە و شەڤە**

– (کوردە نەسیبا شێخ ظاهر تونس) (**١٩٥٦- ١٩٩٢**) دەمێ زڤریناوێ بۆ ئەمریکا لرێکا مێردینێ بزیلەکا عەسکەرێ تورك شەهید بوو

لەلای ڕاستی گۆڕەکە نوسراوە:

**توزینا منی ئەز مەمێ تەمە**
**جزیرا بوتا پڕ ئاخ و خەمە**
**ئەگەر زین نەبای چ دکەی ل بوتان**
**مەم جگەر خولینم مەم وەکی شێتان**
**گوڵی دهۆکی تەچومساندن**
**دلێن بێ مراد تەهەلوەشاندن**

لەسەر کێلەکەی بەر پێی نووسراوە: **چاڤەرێ تەبوون سێبەرو پەروەر**
**چەند هێڤیا تەبی کورێ تە رەهبەر**
**کەسەرا تەیە خەبات و خەنجەر**
**ساخکەم ئومێدا کوتەبێ باوەر**
**هشیار پڕ خۆشی تەلعەوە نداکر**

لای چەپی گۆڕەکە: **ئەی بلبل ئەگەر تو ئەهلی حالی**
**پەروانەیێ شەمعی وەردێ ئالی**

| | |
|---|---|
| **زینا مە ژ سوور گوڵانە گەشتر** | **بەختێ مە ژ تالعێ تەڕەش تر** |

**لەژێرییەوە نووسراوە (خانی)**

* ئەم کێلە وەکو تۆمارێك دێتە بەرچاو کە کورتە مێژوویەکی ژیـانی کەسـە مردووەکـەی تیادا تۆمار کراوە بێگومان ئەو کەسەش کەسێکی بەناو بانگ بووە.

– (الشهيد) (رمضان محمد عبدالرحمن) لە دايكبوونى ١٩٥٧ و لە **١٩٨٣** شەهيدكرا فى قاطع الاحواز.

لەسەر کێڵەکەی لای پێی/ **یا قارئ كتابی ابكی علی شبابی**

**بالامس كنت حیاً والیوم تحت الترابی**

* شايەنی ئاماژە پێ دانە کە ئەم دێرە شیعرە عەرەبییە زۆر دووبارە دەبێتەوە لەسەر گۆڕەکان هەر لەم گۆڕستانە لەسەر چەند گۆڕێکی تر تۆمار کراوە.

– خودی ژ رازی لیوا خلیل نعمت دوسکی

ژ دایکبوون **١٩٥٤/٧/١** وە غەرکرن **٢٠٠٤/٢/٢٩** لەسەر کێڵەکەی نووسراوە خلیل دۆسکی ئەندامی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) وەزیری ڤەگوهاستن و گەهاندن حوکمەتا هەرێما کوردستانێ.

* واتە زۆرجار پلەو پایەو کاری مردووەکە لەسەر گۆڕەکە دەنووسرێت.

**گۆڕستانی چراغ- هەولێر**: کە دەکەوێتە ناو بازاڕی شێخەڵڵای هەولێر و نزیکە لە قەڵاوە، و لەم گۆڕستانەشدا نموونەیەکی یەکجار زۆرمان وەرگرت لێرەدا هەندێك لەو نموونانە باس دەکەین:

– ئەمە گۆڕی خوا لێ خۆش بوو (مەلا حسین شێخ سعدی شاعیر و مفسری کوردی) لە **١٩٨٣** کۆچی دوایی کردووە.

لەسەر کێڵەکەی بەر پێی/ **ئەی کەرمت هەم نەفەسی بێ کەسان**

**بێ تۆ نییە هیچ کەسی بێ کەسان**

**بێ کەسم و هەم نەفەسم هەر ئەتووی**

**روو لە چ کەم ئەی کەسی هەر بێ کەسان**

**(مەلا حسین شێخ سعدی (فانی)**

* جێی ئاماژەیە کە گۆڕی شاعیر و هونەرمەندان لەناو گۆڕستانەکاندا زۆرجار دیارە چونکە شیعری زۆری لەسەر نووسراوەو زۆرجاریش ئەو شیعرانەی کە نووسراوە بەرهەمی شاعیرەکە خۆیەتی ئەگەر مردووەکە شاعیر بێت.



– عبدالجبار اغا (کانی) کوڕی مەلا عبدالرحمان دوغرەمەچی لە **١٩٥٧/٥/٢** کۆچی کردووە.

لەلای ڕاستی گۆڕەکە/ **خزمینە وەرن تاکو بە قوربانی وەطەن بین**

**قوربانی چیاو دەشت و بیابانی وەطەن بین**

**تاکەی لە کونو قوژبنی وێرانە بمێنین**

لای چەپ/ **با امیدی لەسەر کوششی عمرانی وەطەن بین**

**تاکەی (کانی) ئەدوێی لە ئەو صافی خەت و خاڵ**

**وا چاکە لە مەولا کە غەزەل خوانی وەطەن بین**

* (کانی) یەکێکە لە شاعیرە بە ناوبانگەکانی شاری هەولێر کە بەرهەمی بۆ ئەدەبیاتی کوردی جێ هێشتووە.

– کاوە شێروان طلعت/ لاوە شێروان طلعت

١٩٨٥-١٩٩١ شەهیدکرا/ ١٩٨٦- ١٩٩١ شەهیدبووە

**لەسە کێڵەکەی کاوە** **لەسەر کێڵەکەی لاوە**

**بە گولەی زۆردار شەهیدیان کردم** **ناوت لاوەیە کوژراوی بەلاوی**

**ناوم کاوەیە وەك کاوەی کوردم** **جێگات بەهەشتە شەهید کراوی**

– ئارامگای شاعیری نیشتمان پەروەر (شێخ جلال شێخ جمیل نەقشبندی (نوری) شاعیر لەڕۆژی عارفات (١٤١٥ك) بەرامبەر بە **١٩٩٥/٥/٩** ماڵ ئاوایی کرد.

لەسەر کێڵەکەی لای پێی/ **چەند بژی ئینسان وا لەم ژیانە**

**ئەنجامی ژیان هەردەم نەمانە (نوری)**

تەنیشتی ڕاست/ **(نوری)م عەبدێکی ڕوو ڕەشم**

**مەنوارە کردەوەو ئیشم**

**لە عفوت بمدرێ بەشم**

**پەنام بردە دەرگاهت بەس**

تەنیشتی چەپ/

**ئەی میوانی خاوەن نەفەس**

**وەی حەدیسی دنیای ناکەس**

دەزانێ نامێنی هیچ کەس
غەیرەز یەزدانی بەرزو بەس (نوری)

لەپارچەیەك لە پاڵ قەبرەکەوە نووسرابوو:

بۆچ لە وێنەم خەم ئەبارێ تێ بفکرن زۆر بەورد
ترس ئەکەم بمرم نەبینم سەربەخۆیی قەومی کورد

* وەك ئاماژەمان پێ کرد زۆرجار لەسەر گۆڕی شاعیران دەقی شیعرەکانی خۆیان دەنووسرێت، واتە ئەم دێرە شیعرانە بەتایبەت بۆ سەر گۆڕەکە نەنووسراون، بەڵام لە دیوانەکەی هەڵبژێردراوە.

– بمزيد من الاسى والحزن الشهيد البطل (دلاوەر محمد احمد) استشهد في قاطع البصرة في ١٩٨٢.

ئەم کۆمەڵە شیعرەی کە دێت هەمووی لەسەر ئەم گۆڕەو قەفەسەکەی نووسرابوون:

بۆ شەهیدێکی کە گەوزیوە لەنێو خوێن دەگریم
بۆ لاوێکی کەچوو بێ سەر و شوێن دەگریم
تا نەبینم بەدەستی پەری ئازادی
گوڵە شلێرە لەگشت لایەك نەڕوێ دەگریم

کۆچی دوایت کرد برای داماوم     ڕووناکی دڵ و هێز و هەناوم
منیش لەدوای تۆ هەتاکو ماوم     نابێ وشك کەم فرمێسکی چاوم

قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین
میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین
میللەتێ لاوی لەرێی سەربەخۆیی نیشتمان
بێتە بەر سێدارە دەم بە خەندەو پێکەنین
ئەو کەسەی گیانی بۆ سەربەخۆیی نیشتمان تەرخان ئەکا
پێی مەڵێن مردووە شەهیدە وا لە فیردۆسی بەرین



وتیان ئەو ڕێیەی کە تۆی لەسەری     مانای ئەوەیە بەلاوی دەمری
منیش پێم وتن ئەم ڕێیە نەگرم     بە گەردن کەچی و کەساسی دەمرم

دایە گیان نەیەیت لەسەر گۆڕەکەم فرمێسك برژێنی
لەبیر و هۆشی کوردایەتیدا دام بچڵەکێنی
لە جیاتی ئەوە بەزەردەخەنەو دەم بەپێکەنین
لە هەر باغ گوڵێك لەهەر چلێك بۆم بروێنی
لەم شا گوڵانە کام گوڵ ئاڵە وەك خوێنەکەم
خۆت پەسەندی کەو هەڵیبژێری و بۆمی بهێنی

ئەی سەربازی بەخوێنی ئاڵ و بەرگ سوور
جوامێری سەر ڕێبازی سەخت و دوور
ئەی ئەندامی جێ نەماو قەت لە کاروان
ئەی سەربازی شۆڕشگێری نیشتمان
ئەی شەهیدی ئەی شەهیدی ئەی نموونەی ئازادی
نەڕژا خوێنی تۆ بە خۆڕایی
ئەو لەشانەی بە گولەدا بێژران     دڵ گەرمی میللەتن تا ڕزان
خوێنت داڕشتووە بەداری ئازادی     دێ بەدوای شینی تۆدا شادی

– شەهیدی نەمر (شێرزاد ئەحمەد ناسراو بە شێرزاد سەر سپی) ١٩٦٣- ١٩٨٦ بە دەستی فاشییەکانی بەغدا شەهید کرا لەسەر کێلەکە نووسراوە:

چاوەڕێمە کە بەند کرێم     با لە عەشقی تۆدا بسوتێم
بێ سەربەستی ئەمن کێم     مافم نەبێ من کوێرە ڕێم
چاوەڕێم بۆ مافەکەم     پەتی سێدارە لەمل کەم
هاوار ئەکەم کوا مافەکەم     تا سەربەستی دەستگیر دەکەم

*هەروەکو وتمان زۆرجار لەسەر گۆڕەکە هۆی مردنەکە دەستنیشان دەکرێ وەك ئەو نموونەی سەرەوە.

– هذا قبر المرحوم (بارزان فاضل شريف) (١٩٦٢-١٩٩٦) لەسەر کێلەکەی: (بالمصطفى المجتبى خير الانام

ومن جلاله نزلت في مدحه السور)

| | |
|---|---|
| – چیمن ابراهيم عبدالصمد | دیمن ابراهيم عبدالصمد |
| ١٩٧٣- ١٩٩١ شەهیدکرا | ١٩٧٠-١٩٩١ شەهیدکرا |
| لەسەر کێلەکەی بەرپێی | لەسەر کێلەکەی بەر پێی |
| **جاران دەیان گوت کوڕ بەرخی نێرە** | **دیمن قوربانی خاکی وڵات بوو** |
| **کەچی ئەمڕۆکە کچی کورد شێرە** | **پایەی شەهیدی بۆ بەخەڵات بوو شەهیدیی** |
| **خوشکە چیمن، جێت بەهەشتە** | **بڵێ دیمن شەهیدم جێم دیارە** |
| **نەبێ ترست بەهەشت دەرچوو کەبەشتە** | **بەهەشت ئەمری خوای پەروەردگارە** |

– لەسەر دوو کێلی بچووك لە تەنیشت یەکترییەوە نووسراوە

**ادریس و ئەسرین خوشك و برانە     تاقانەی دایك و باب و برانە**

**پایز هات و گەڵا ڕێزان     لەگەڵ کوڕی خۆ دەست لێك بەردانە**

– شەهیدی نەمر (محمد) ١٩٩٥ شەهید کرا

لەسەر کێلەکەی:

**سەرم سەرێکە چەندین سەودایە**

**عەشق و نیازم هەر بەهیوایە**

**خۆم شەهید بووم     ئەوە دڵەکەم جێ مایە**



– گۆڕی جوانە مەرگ (هێرش گەیلانی سید احمد) (١٩٧٣-١٩٩٥) کۆچی دوایی کرد.

لەلای چەپ/ **شەو هات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی هێرشێکم**

**مەشغولی نەفەس گرتنی موشکین نەفەسێکم**

**باوەڕ مەکە روح سەختی غەمی فرقەتی تۆ بم**

**بۆ هاتنی تۆ باقیە نیوە نەفەسێکم**

لەلای ڕاست/

**دەروونم پڕ خەم و دەردەبێ تۆ     دڵم گەرمە هەناسەم سەردەبێ تۆ**

**عەزیزم دڵ ڕەقەو خۆم فەردو تەنهام  دەترسم بم کوژێ ئەم دەردە بێ تۆ**

* ئەم شیعرە لە دیوانی (نالی) شاعیرەوە وەرگرتراوەو دەستکاری کراوە تاکو بگونجێنرێ لەگەڵ ناوی کۆچ کردۆکە.

– ئارامگای کۆچ کردوو (فاطمة محمد رواندزی) یە (١٩٣٩- ٢٠٠٤/٧/١٧) لەسەر کێلەکەی

**لای پێی/ بۆ کۆچ کرنت دایکی شیرینم**

**هەرگیز چاك نابێ زام و برینم**

* لەسەر ژمارەیەکی زۆری گۆڕەکان ئەم دێرە شیعرە دووبارە بۆتەوە وەکو ئیپیتافێکی تایبەتی لێ هاتووە لەسەر گۆڕی دایکان دەنووسرێ.

– گۆڕی دیلان اسکندری جوانە مەرگ (١٩٨٣-٢٠٠٤)

لای چەپ/ کن فی الدنیا کأنك غريب- أوعابرسبيل

– لەسەر قەبرێك هیچ ناوی لەسەر نەبوو نووسراوە

**هێشتا شەقاوی دڵداریت کرچ و کاڵ بوو* وا کەت و پڕ بەو ناواختە بارگەی تەمەنت تێکناو، کەس بە سەفەرتی نەزانی... نایێتەوە؟ مظفر ....**

– حاجی جمال سعدالله مولود (١٩٣٢-١٩٩٥)
لەسەر کێلەکەی بەرپێی/ **ارجوك ياربی في الدارين ان ترحمنا**
**بجاه من في يده سبح الحجر**
چەپ/ **يا نفس لا تفظي من ذلة عظمت        ان الكبائر في الغفران كالمم**
ڕاست/ **لعل رحمة ربي حين يقسمها   تاتي على حسب العصيان في القسم**
* ئەم دێرە شیعرە عەرەبییانەش چەندین جار دووبارە دەبوونەوە لەسەر گۆڕەکان.

– بێستان محمد علی (١٩٦٩-١٩٩٢)
لای چەپی گۆڕەکەی/ **الهی لست للفردوس اهلاً      ولا اقوى على نار الجحيم**
**فهب لي توبة واغفر ذنوبي    انك غافر الذنب العظيم**
ڕاست/ **يا قارئ كتابي ابكي على شبابي      بلأمس كنت حياً واليوم تحت الترابي**
* ئەم دێرە شیعرانەش زۆر دووبارە دەبوونەوەو لە هەموو گۆڕستانەکانیش.

– ڕەوەند محمد (١٩٥٧- ٢٠٠٧)
لەسەر کێلەکەی نووسراوە: **ڕۆلەکانم قەت نەڵێن باوکمان نەماوە**
**هەموو کات لەلاتان روح و گیانم بەجێ ماوە**
– شەهید (هێرش رەمزی رەواندزی) (١٩٧٢-١٩٩١)
لای چەپ/ **نامەوێ ژیانێ بەسەر شۆڕی دوژمنان**
**بمخەنە ناو چەسپی خانەو زیندانەکان**
**سزام بدەن بەبێ هیچ سوچ و تاوان**
**ماڵ و گیان فیدابێ بۆ کوردستان**
**تا نەوەی کورد بژی بەسەر بەرزی لە نیشتمان**
– گۆڕی (شەوبۆ خالد بەگ) (١٩٨٣-١٩٨٩) بەکارەساتی ئۆتۆمبێل مردووە/ لای خوارەوەی کێلەکەی نووسراوە/ (یا محمد)
لە تەنیشت/ **شەوبۆ گوڵێك بوو لەناو باخی ژین**
**خەزان وەراندی بەدڵی پڕ قین**
**شەوبۆی پەپوولە تێر نەیمژی گوڵ، بوو بە کەسەرو جێ ماڵە سەردڵ**



– سالار عارف سليم (١٩٦٢- استشهد فی ١٩٨٢)
لەسەر کێلەکەی/ **يا قارئ كتابي ابكي على شبابي**
**بلأمس كنت حياً واليوم تحت الترابي**
لەسەر قەفەسەکەی نووسراوە/ **بای ئەجەل هات و لەناکاو دەفتەری ژینی دڕیم**
**تاکو دوێنی خونچە گوڵ بووم        ئەمڕۆ بەناحەق هەڵوەریم**
* ئەم دوو دێرە شیعرە عەرەبی و کوردییە زۆر دووبارە دەبنەوە نەك هەر لەم گۆڕستانە بەڵکو لە گۆڕستانەکانی تریش.

– (زکیەخان بنت محمد اغا) توفيت فی ١٣٨٨ هـ
چەپ/
**لعل رحمة ربي حين يقسمها        تاتي على حسب العصيان في القسم**
**يا رب بالمصطفى بلغ مقاصدنا        واغفر لنا ما مضى بواسع الكرم**
ڕاست/
**يا سيدی يا رسول الله يا سندی        ضاقت بي الحال ادركني وخذبيدي**
**مالي سواك ولا اوی الی احد**
لەسەر کێلەکە/ **يارب عفواً بجاه المصطفى كرماً واغفر ذنوني اذ الاموات قد حشرت**
– شەهناز خاتوون بنت سلیمان ئاغا (١٣٩١هـ) کۆچی کردووە
ڕاست/
**يا سيد السادات يا باب الحمى        يا من على الرسل الكرام تقدما**
**اني التجئت الى لقمان فظلكم        فانضر الى تكرم وترحما**
چەپ/
**انى مغريك الا اني على ثقة        من الخلود ولكن سنة الدين**
**فمن المغزى بباق بعد ميته        ولا المغزى ولو عاش الى حين**

– گۆڕی خوا لیّ خۆش بوو (محمد اسماعیل محمد) (١٩٢٩-١٩٧٣)

چەپ/

**مهماطال الليل فلابد من طلوع الشمس**

**مهما طال العمر فلا بد من دخول القبر**

– شەهید ئەندازیار (هۆشیار سلێمان عبدالرحمن) (١٩٥٤-١٩٨٨)

**ماڵ ئاواییم کرد لە هاوڕێکانم    بە پایز گەڕا بەهاری ژینم**

**نەم چەشت لەتامی سەرەتای لاویم    بێ بەزەییانە هەڵیان وەرانم**

– خوا لیّ خۆش بوو (یوسف نادر) (١٩٦٦-١٩٨٦) لە قەرەداغ شەهیدکرا

لەسەر کێلەکەی نووسراوە/

**قەبرم بۆلیّ مەدەن دوو بەردم بەسە**

**بە گڵ دام پۆشن بڵێن بیّ کەسە**

لای کێلەکەی بەر پێی/

**لە بیرت نەچیّ ڕۆژانی هەینی**

**بێیتە سەر گۆڕم گوڵم بۆ بێنی**

**قەد بۆم نەگری ڕام نەچڵەکێنی    لەو خەوە خۆشە بە ئاگام نەێنی**

– صائعە غەریب قادر (١٩٥٩-١٩٨٣)

چەپ/

**ايها الزائر على قبري قف على قبري ملياً**

**واتل القران عند مزاري رحمة تنزل علي**

لای ڕاست/

**فریشتەی یا پەری یا حوری ئەی شۆخی مەلك شێوە**

**بە عیشوەو خولە هاو جینسی بەشەڕ ناکەی ئەڕۆی (سائیعە)**

* ئەم دێرەش لەدیوانی (گۆران)وە وەرگیراوەو گونجێنراوە لەگەڵ ناوی کۆچ کردووەکە.



– شەهید انور ابوبکر قادر (١٩٦٢- ١٩٨٥) لە هەولێر سەری نایەوە

لەسەر کێلەکەی/    **بنووسن لەسەر کێلی گۆڕەکەم**

**ئازاری زامە پڕ ناسۆرەکەم**

**ئەو زامەی کۆرپەی لەدایك جیا کرد**

**ئێوەی پڕ دەردو جەورو جەفا کرد.**

– السید محی الدین صادق الجباری توفى فى ١٩٨٩

لای چەپ/

**بابە گیان گوڵە دوورەکەی مجلسی جەباری**

**هیوات بوو دیسان ببینی بانگول بە ئاوا**

**بەڵام لەخزم و کەس دوور لە خاکی غەریبی بای**

**ئەجەل بەڕوت هات و پێتی کرد ماڵئاوا.**

– گۆڕی شەهید (کمال یاسین شریف) (١٩٦٥-١٩٩٥) لە ئەبو غریب بەدەستی ڕژێمی فاشی لە سێدارە درا. ناسراو بە (کمال بیّ کەس)

لای ڕاست/

**بای ئەجەل هات و لەناکاو دەفتەری ژینی دڕیم**

**تاکو دوێنیّ خونچە گوڵ بووم    ئەمڕۆ بە ناحەق هەڵوەریم**

لای چەپ/ وەسیەتی شەهید

**بەدایکی سەرکەوت بڵێن لەسەر گۆڕەکەم بنووسیّ (شەهید کمال بێکەس) هەموو (١١)**

**ئازاریّ یادی من پرچی نیازو بەناز بێنیّ بەنێرگز تا ڕۆژی نەورۆز لەسەر گۆڕەکەم شین بێت.**

– ئازاد جبار صالح لە شەوال کۆچی کردووە.

لەسەر کێلەکەی:

**ذهب الشباب فماله من عودة    واتى الشيب فاين منه المهرب**

– گۆڕی خوا لێ خۆشبوو (عائشە عزیز قادر بەگ) (١٩٢٥- ١٩٩٢)

لای چەپ/

**مردن زۆر هەقە شینم بۆ مەکەن بەخۆشی دنیا قەد باوەڕ مەکەن خوادا یارم بێ جێگەم بەهەشتە خۆش دەژیم لەگەڵ حوری و فریشتە**

**لەژێرییەوە نووسرابوو (کەریم شارەزا)**

– سید صباح سید حیدر (١٩٧٤) لەتەمەنی ٢٣ ساڵی گیانی پاکی خرایە ژێر گڵ

لەسەر کێلەکەی/ **تۆ نەمردوویت زیندووی هەرگیز**

**زستان، بەهار، هاوین، پاییز**

**هەر ئەمێنی تا مابێ ئەم ناو گڵە    ناوی تۆ جێی لە نیشتمانا ناوی دڵە.**

– نەوشێروان خەسرۆ میرزا (١٩٨٠-١٩٩٩)

ڕاست/

**ئەگەرچی ڕۆیی قەت ناچێ لەیادم    دەکەن یادت بەیادی تۆوە شادم**

**کە بارگەت برد هەوارت تێك نا عەزیزم    شکا ئەستوندەکی تالی مرادم**

چەپ/

**کورم خۆ تۆ نەماوی تا ببینی    کە باوکت چەند ناسورە برینی**

**نەتۆی پێ دێتەوە نەعەقڵی ئەبڕێ    لەسەر تۆ کام یەخە کام ئەستۆ بگرێ**

- شەهید بدر الدین عزیز (١٩٥١-١٩٩١) شەهید کرا

چەپ/ **مەرێژن بۆم فرمێسکی خەم    کە سوورە لەخوێن جەستەم**

**شەهیدی دەستی زۆردارم    بەڵام ئۆخەی کە پێشمەرگەم**

ڕاست/ **ئەو ڕێگایەی من لە بۆی کوژرام    لەنێو گۆڕیشدا دڵنیام**

**کە ئێوەی شۆڕش گێری کورد    ونی ناکەن خوێن و هیوام**

* ئەم دێرە شیعرانەش زۆر دووبارە دەبوونەوە لەسەر گۆڕەکان و بەتایبەتی گۆڕی شەهیدە پێشمەرگەکان.



– خوا لێ خۆشبوو مجید محمد امین سلێمان (١٩٤٣- ١٩٩٧)

لای چەپ/    **شاعیر، قەڵەم لەدوو مەرەکەب هەڵدەهێنێ**

**یەکەم مەرەکەبی خوێنی دووەم مەرەکەبی شینی**

**قەڵەمی شاعیر هەمیشە پڕ، چك نابێ... کۆتاییەکەی دیار نەماوە.**

– گۆڕی شەهید وەصفیە شهاب خطاب ١٩٧٤-١٩٩٦ بە کارەساتی دڵ تەزێن

چەپ/ **الا یا نائم اللیل کیف المنام یطیب    الموت حق ولکن الفراق صعب**

ڕاست/ **الانسان العظیم هو الانسان**

**الذي یضحك عندما تکون دموعه علی وشك الانهیار**

* جاری دەبێ وتەی بەنرخ و پەند لەسەر گۆڕەکان دەنووسرێ.

– خوا لێ خۆشبوو (بیان مصطفی درویش) (١٩٥٨-١٩٩٤) بە کارەساتێکی دڵتەزێن

**خونچەی بەهار بوویت ئەگەشایتەوە    بەجوانە مەرگی سەرت نایەوە**

**خۆشیت نەچێشت ساتێ بەشادی    کۆرپەت بەجێ هێشت بەبێ مرادی**

– الملازم هیوا عبدالله

لای ڕاست/ هیوا هیوا هیوا لەناو دڵماندا هیوا ڕوا

**تروسکەی هیوا ناکوژێتەوە    ئاوات و ئامانج هەر ئەژێتەوە**

**رابردوو کە رۆیی ناگەرێتەوە    فرمێسکی شادی ناگەشێتەوە**

**کاتێ ژێرکەوتی هەرگیز مەسرەوە    سوودی لێ وەرگرەو پێیا سەرکەوە**

– الشهید مراد حسن یونس (١٩٦٧-١٩٩٩)

لای ڕاست/ **الموت کأس علی کل ناس شربها    وللقبر باب کل الناس تدخلها**

لای چەپ/ **الخط یبقی زماناً بعد کاتبه    وکاتب الخط تحت الارض مدفون**

– قاسم مەلا افندی ١٣٨٣هـ کۆچی کردووە.

چەپ/ **قبر حوی قاسها بالجود مشتهر    تحت الثری لسحاب اللطف منتظر**

**فاغفر الهی ذنوباً منه مرحمة    انت الکریم لعفو العبد مقتدر**

لەسەر کێلەکەی لای پێی/ **زادی لأخرتي ديني وايماني**
**والجود يشفع لي في ظل قرئاني**
**يا من اراد جنتي يوم رحلته        قد جا و تاريخه يمر بغفران**

– گۆڕی شەهید شیرین شهاب خطاب (١٩٧٠-١٩٩٦) بە کارەساتی دڵ تەزێن،
لای چەپ/ **یا قارئ کتابی ابکی.........**
لای ڕاست/ **اذا طال الزمن ولم تروني        انظرو صورتي واذكروني**

– گۆڕی جوانەمەرگ (تەنیا واحد عزیز کۆیی ) (١٩٧٢- ١٩٩٣)
لای چەپ/ **لاوە جوانەمەرگ، بالاّ بەرز، تەنیا- نا ئومێدی شار و باخ و چیا**
**گوڵت هەڵوەری بەدوعای ناحەز- یاخوا ناحەزت شێت بێت لە دنیا**
لای ڕاست/
**ئەی هێزی گەردوون خەم ببڕێتەوە        من تەنیام هەرگیز بیرناچێتەوە**
**لە گۆڕیش دابێت هەر بەهیوایمە        پێم وا بێ خەونە کە هەر دێتەوە**
– الشهيد (واحد مجيد فاضل) (١٩٧٣-١٩٩١)
چەپ/ **ئەی شەهید تۆ ئەو گوڵە سوورەی کۆرپەکانی جیهان مزگێنی ئازادیت ئەدەن**
**تۆ ئەو گوڵە سوورەی سەرتاپای مرۆڤایەتی کڕنۆشی بۆ دەبەن**
ڕاست/ **مەڕێژن بۆم فرمێسکی خەم        سوور بووە لەخوێن جەستەم**
**شەهیدی دەستی زۆردارم        بەڵام ئەو خەی کە پێشمەرگەم**

– لميعه رشيد محی الدين (١٩٤٩-١٩٩٥)
چەپ/ **یازم قرەیاز یالدی جان جیگارم ازیلدی**
**هله دونیا قوشویدم تیر نارم قاز یلدی**



– فاروق رەمزی عبدالله (١٩٦١-١٩٧٩) لەسەر قەفەسەکەی نووسراوە:
**کاکی ڕێبوارم بۆ کام کوێستان        وا زوو کۆچت کرد پشتت کردە ژیان**
**کۆچ بۆ خواوەندتاکە        بەرەو بەهەشتی فراوان پاکە**
**با قەلاّ بادەی خەم بنوشین        باشاری هەولێر ڕەش بپۆشین**
**برام کۆچ دەکا بە نامرادی        شکا لەدەستی پەرداغی شادی**

– جوانە مەرگ قوتابی (عبدالصمد عبدالقادر عمر ١٩٧٣-١٩٩٢) بە کارەساتی دڵتەزێن بەدەستی برادەری ناپاك کوژرا.
لەسەر کێلەکەی
**يا واقفاً على قبري لا تعجب من امري        بالامس كنت مثلك وغداً ستكون مثلي**
لای چەپی گۆڕەکە/
**هاوارو گریان بۆ کوڕی شیرینم        بە نا ئومێدی دەرچوو لەژینم**
**لەپاش مەرگی تۆ خۆشی نابینم        شەو ڕۆژ هەردەم خەریکی شینم**
ڕاست/
**ئەی خاك میوانت زۆر خۆشەویستە        دڵی مەشکێنە هەرچی پێویستە**
**تاکە گوڵێ بوو نەگەیشتە بەری        کەچی بای ئەجەل لێدا هەڵوەری**
* ئەم دوو دێڕەی ئەخیر لەسەر چەندین گۆڕ نووسرابوو

– هذا قبر الشهيد الملازم (سيروان عبدالستار جبار) (١٩٦١-١٩٨٧)
لەسەر کێلەکەی/
**لكتب ع اوراق الشجر سافر حبيبى وهجر        يا حبيبى بس متعود بكفى غياب وسفر**
لای ڕاست/
**ئەی نوری دیدەم چرای مەحفەلم... ئارامی گیانم تەسکینی دڵم**
**تۆ حۆری یاخود پەری روحەکەم... کەوا زووبردت ئارامی دڵم.. وەرە ماڵەکەم**
**ڕەوشن کەرەوە... تاریکە بێ تۆ مەنزڵم**

– مەلا مەسعودی بێ بەش (١٩٣٢-١٩٩٨)

لەسەر کێلەکەی/ ڕوو ڕەشم و لەچاکە بێ بەشم
تۆ نەبی مستەحەقی اتشم
پاش مردن تۆ بە نابێ تۆ بەکەم
داخراوە خوایە دەرگەی تۆ بەشم

– ئومێد عبداللە ابراهیم (١٩٨١-٢٠٠٠)

لای ڕاست/
کۆچی دواییم کرد کاتی گەنجێتی    بەهارم جێ هێشت بەدڵ تەنگێتی
ئاواتم زۆر بوو بیهێنمە دی    کەوتمە ناو گۆڕ هیچ ژیانم نەدی

– فەتاح عزیز حاج ویسی قصاب

لەسەر کێلەکەی/ الی ربك العالي رفعت حواجيي
وجئت بطلب المصطفى التشفع
سألتك بالفظل الذي انت اهله
وان لم اكن اهلاً لما فيه اطمع

– گۆڕی شێخ یونس افندی ابن حسن افندی ١٣٧٧هـ

لای چەپی گۆڕەکە/ مالی سوی فقدی الیك وسیلة
فإذا طردت فاي باب اقرع

– **گۆڕستانی شێخ محی الدین – کەرکوک:**

ئەم گۆڕستانەش وەك باسمان کرد دەکەوێتە نێوان گەڕەکی ئیمام قاسم و ئیسکانی شاری کەکورک، لە تەواوی ئەم گۆڕستانەش کۆمەڵێك نموونەمان وەرگرت لێرەدا باسی دەکەین، بەڵام ئەو نموونە شیعرانەی کە دووبارە دەبنەوە زۆر، هەر یەکجار ئاماژەی پێ دەکەین و هەروەها نموونەیەك کە لە گۆڕستانێك وەرمانگرتبێ و لە گۆڕستانێکی تر دووبارە بێتەوە ئەوەش زۆرجار نەماننووسیوەتەوەو تەنها ئاماژەمان بە زۆر دووبارەبوونەوەی دێڕەکە کردووە، چونکە ئێمە



مەبەستمان ژماردنی گۆڕەکان نییە بەڵکو وەرگرتنی ئەو دەقەیە کە لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراون جا لەبەر زۆری ناکرێ ئەو نموونانەی کە زۆر دووبارە دەبنەوە هەمووجار ئاماژەیی پێ بکەینەوەو تەنها ئەگەر گۆڕانێکی تیاکرابێت دووبارە دەیخەینەوە ڕوو، نموونەکانی ئەم گۆڕستانەش بریتین لە:

– گۆڕی (محمد کریم مصطفی)یە لە ١٩٨٦/٣/١٤ شەهید کرا لەسەر گۆڕەکەی و قەفەسەکەی ئەمانەی خوارەوە نووسرابوو:

لەسەر گۆڕەکەی و قەفەسەکەی ئەمانەی خوارەوە نووسرابوو:
ژیانی لاویم وێنەی گوڵی بوو    کە هاتە سەر ژین هەڵوەری زوو
بە ئاخ و حەسرەت بەدڵ زامەوە    لەباوك و دایك لەبراو خوشکان دوور
تا گیانم دەرچوو شەوێك مامەوە    لە چیای چوارتە ئەتلامەوە
کەسێ نەبوو لام... بێ کەس ئەمناڵان    ئینجا بۆ کەرکووك هێنامیانەوە.....
ئێستاش لەباتی بەزەیی و ڕەحمەت "هذا ما وعد الرحمن وصدق" یەك فاتیحایەك گەر نابێ زەحمەت
محمد شەهید بوو چوو لەدەستمان    بردی لەگەڵ خۆی مەیل و هەوەسمان
وەرنە سەر گۆڕم ئەزیزان ئەمڕۆ سەر قەبرامە
ئەمڕۆ یادی جوانە مەرگی و شیوەن و گریانمە
* هەمان شێوەی ئەم شیعرەی سەرەوە لەجێی تر دووبارە بۆتەوە

– شەهید (ئازاد نوری فەقێ) (١٩٥٧-١٩٨٨) لەسەر ڕووباری کاروان لەدەشتی عەبادان شەهید بووە.

یاران گەر هاتنە سەرم بگرین بەکوڵ    تەمەنی لاوییم نەبردە سەر وەك گوڵ
هاوارتان بگاتە ئاسمان بڵێن داد    چ وەختی خەزانی گوڵت بوو کاك ئازاد

– شەهید (ابراهیم توفیق محمد) لە (١٩٨٢) شەهید کراوە

لەسەر مەحەجەرەکەی/ ئەی شەهیدان ئەی شەهیدان
نامرێ ناوو نیشانتان
تا شەهید خوێنی نەڕێژێ    تا گەنجیش تاڵی نەکێشێ
داری ئازادی شین نابێ    باخی ژینمان ڕەنگین نابێ

* ئەم شیعرە کراوە بە گۆرانی و لەسەر چەند کێلی شەهیدی تر نووسرابوو

– شمس الدين عبدالرحمن محمد لە (١٩٨٤) شەهید کراوە

لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە/ **شەهید ئەرزە شەهید گریانە**

**شەهید ئاسمانە شەهید فرمێسکە**

**من ئەو شەهیدەم گریانم ناوێ      ئەوەی شەهیدە کفنی پێ ناوێ**

**بۆ شەهیدێکی کە گەوزیوە لەخوێن دەگریم**

**بۆ هەڤاڵێکی کەچوو بێ سەرو شوێن دەگریم**

– الشهيد البطل ملازم (ازاد كريم رحيم حميد) استشهد في خانقين في ١٩٨٣ لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە.

**دڵم هەر ئەو دڵەی جارانە ئێستاکەش ئەناڵێنێ**

**هەناسەی ساردی ناکامی لەسینەمدا ئەتاسێنێ**

**ئەی خاك دەخلیتم قەدری بزانی      ئازاری نەدەی ئازاد لات میوانە**

**پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین**

**نامرن ئەوانە وا لەدڵی میللەتا ئەژین**

**دەست و پێت سوورکردوون کێ بێ لەوان وردبێتەوە**

**خوێنی دڵمە وا بەدەست و پێتەوە**

– برهان علی محمد (١٩٨٠-٢٠٠٠) بەکارەساتی دڵتەزێن مردووە

لای ڕاست/ **ئێمە هەموومان هەوڵی خۆراکین**

**نازانین خۆمان خۆراکی خاکین**

– سعدیە سید گڵ لە ١٤/٤/١٩٩٧ کۆچی کردووە

لای ڕاستی گۆڕەکە/ **سەعدیە خان بۆ کۆچت کرد**

**هەواری حاجی قادرت بۆچی چۆڵ کرد.**



– الشهيد البطل (عبدالخالق محي الدين) استشهد في القاطع الجنوبي في (١٩٨٣) لە دەوری مەحجەرەکەی ئەمانە نووسرابوو:

**ویستم بخەوم خەو چووە چاوم      لە خەوما مردم نێو گۆڕ نێژراوم**

**ویستیان بەگڵ لەشم داپۆشن      لەخەودا ڕاپەڕیم سەیرم کرد ماوم**

*** ئەگەر ئەمزانی چ ڕۆژێ دەمرم      لەبەر مردن گەردن ڕادەگرم**

**لەشاری زیندان بەرامبەر مردن      ئالآی یاخی بوون خێرا هەڵدەدەم**

*** بە ئاخ هەڵکێشتن دڵ سۆزە گیانم      بۆ ئەو دڵەی پڕ ئازارو ژانم**

*** با تەمەن بیبا بەرەو پێشەوە      بەرەو ڕووی مردن دڵ بە ئێشەوە**

**بە ئارەزوو و گیانی دڵەوە      بچمە ناو خاکی بەردو گڵەوە**

*** ئەو هیوا بەرزەی لە ژیانا      ونی نەکەی لە شینو گریانا**

– (عبدالله علی توفیق رحیم ولی) لە (١٩٨٣) کۆچی کردووە بە دەوری مەحجەرەکە نووسراوە.

**ژیانم سەردەمی بە کیف خۆشی      بە شادی کڕین بەخەم فرۆشی**

**هەتا پێم کرا ڕوومەتیم مژی      هەتا پێم کرا شەرابم نۆشی**

**تۆش کەچی مەیلت کەم ئەبێ      دڵم دووچاری دەردو خەم ئەبێ**

*** فریشتەی خەم سەری سوڕماوە ئەمشەو**

**ئەوەندەی خەم بەم و بەو داوە ئەمشەو**

*** ئەم جیهانەمان ئێش و ستەمە      چەندی ڕابوێری هێشتا هەر کەمە**

**بەر لەوەی کە خەم سەرنگونت      کا دەری کە لەدڵ تۆ ئەو خەمە**

— امين محمد سعيد ليلانى/ موفق امين محمد سعيد ليلانى

١٩١٨- ١٩٨٥ / ١٩٤٢- ١٩٩٢

لەسەر محەجەرەکەیان نووسراوە

**سوور و لێڵ بوو چاوی گەورەو بچووك دڵ پڕ لەزام**
**ئەم برینەش بوو بەزامی سەختی سەرزامانەوە**
**دای بە گوێدا شەماڵ و دەنگی بە سوێێ گریانەوە**
**شینە شینی لەیلا نییە کەوتە ناو خزمانەوە**

**لە خاکی گڵ کۆما ئەی گۆڕستان گەر ئاخێك بنێژە**
**بە کێلی مەڕمەڕا فرمێسکی تەڕ لە چاوم بنێژە**

**لەپڕ تاریك بوو چاوم وتم یاران چی ڕووی داوە**
**وتیان ئەی نازانی گەردوون (ئەمین) لیلانی لەگەڵ ناوە.**

— ئەژین جەبار ئەحمەد زەنگەنە (١٩٨٦- ٢٠٠٣)

لەسەر کێلەکە/

**دایەگیان هەرگیز مەڵێ ڕۆڵەکەم بەبێ کەسی سەری نایەوە**
**ئەو خاکەی بەدرێژایی تەمەنم ئاشق و سەودا سەری بووم**
**ئەوەتا ئێستا تك تك خوێنم دەمژێ لەدڵی خۆیدا جێم دەکاتەوە**

— شەوبۆ کاوە مەحمود (١٩٨٥-٢٠٠٤)

**تاقانە بووم دەگەڕام بەدوای حەقی خۆمدا**
**نەمزانی مردنیش حەقی بەدەستەو دەگەڕێ بەدوامدا**

**نەبوو دکتۆرێ تا بزانێ دەرمانی دەردم چییە**
**بێ چارە خۆم لە مەرگ زیاتر ئەم دەردەم دەرمانی نییە**



* زۆربەی ئەو مردووانەی بە نەخۆشی مـردوون لـەم جـۆرە شـیعرانە لەسـەر گۆڕەکانیـان نووسراوە.

— ئەنوەر عبدالرحمان لە ١٩٤٢ لە هەڵبجە لەدایك بووە
و لە ١٩٧٧ لە کەرکووك شەهید بووە

**کەم ژیان و کەل ژیان**
**ئازادی بێ خوێن ڕشتن مەحاڵە      بمرێ دوژمن نامەوێ ئەم ژینە تاڵە**
**بەشێکم نەدی لە کوردستانا      خوێناوی کوردی تیا نەڕژابێ**
**یان چیایەکی ئەم کوردستانە      هەزاران مێشکی پێدا نەپژابێ**

**مەڕێژن بۆم فرمێسکی خەم      کە سوور بووە لەخوێن جەستەم**
**شەهیدی دەستی زۆردارم      بەڵام ئۆخەی کە پێشمەرگەم**

* هەندێك لەو دێرە شیعرانی لەسەر گۆڕەکان نووسراوە لە گۆڕستانی سلێمانی و هـەولێر و کەرکووکیش بەهەمان شێوە دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش دیاردەیەکی ئاسـاییە چـونکە هـەموو گۆڕستانەکان شەهیدی لێیەو حاڵەتەکانی مردن بە نەخۆشی بەکارەسات بە ڕووداوی ئۆتومبێـل دووبارە دەبێتەوە جا بۆیە زۆرجاریش شیعرەکان بەیەك دەچن و جیاوازییەکی کەم لە نێوانیانـدا هەیە. ئەمەش واتای ئەوە نییە کە هەر گۆڕستانێك کۆمەڵێك شیعری تایبـەتی بـەخۆوە نییـە بەڵکو هەر گۆڕستانێك بەپێی ڕادەی ڕۆشنبیری خەڵکی ئەو شارەو جۆری ئەو کارەساتانەی کـە بەسەر شارەکەدا هاتووەو بارودۆخی خەڵکەکەی بابەتی شیعری سەر گۆڕەکان دەگۆڕێ جا لەبەر ئەوە ئەوەی شتی گشتییە دووبارە دەبێتەوە، بەڵام تایبەتییەکان دەمێنێتەوە تایبەت بەکەسێك و بە شوێنێك.

— نظام عبدالجبار سعید لە ١٩٨٣ لە کەرکووك لەدایك بووە لە ٢٠٠٥ لـە کـەرکووکی کوردستان شەهید بوو.

لەسەر کێلی لای سەری نووسراوە/      **شەهیدی خاکی کەرکووکی کوردستانم**
**لەیاد ناکرێم لەناو هاوڕێکانم**

– فتحیة محمود حسین لە ١٩٩٢ کۆچی دوایی کرد.

لای ڕاستی گۆڕەکە/ **عەقلم وتی بنووسە دەخیلە شینوزارم**
**دڵم زۆر کەیلە ئیمڕۆ شریکی احزانم**
لای چەپی/ **ئەگەرچی دەردەکەی من بێ دەواییە   لەلای تۆ سهلە حلی مشکلاتم**

– الشیخ لطیف الشیخ طاهر البرزنجی/ ١٩٩٧ کۆچی دوایی کردووە لە ڕۆژی جومعە/ لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە: **سڵاو لە یادت ئەی شێخی ئازا**
**نەوەی حوسێنی شێخی کەربەلا**
**بنو لەو کەلە هەوارگەی دینە   کە جێگای حەزرەت شێخ محیێ الدینە**
**هاواریان هێنا وتیان شێخ محێدین   گوڵێك هەڵوەری لە باخچەی ئەمین**
**جوابی دایەوە بەزمانی حاڵ   وتی بەخێربێت خاوەنی بەرماڵ**

* ئەم گۆڕەی سەرەوە نزیك گۆڕی شێخ محی الدین کەرکووکە لە گۆڕستانەکەدا

ئەندازیاری جوانەمەرگ (چراخان زەنگەنە) لە ١٩٩٧ کۆچی کرد

لای چەپ/ **خونچە گوڵێك بوو وا هەڵوەرا   پەپوولەیەك بوو لەدەوری چرا**
لای ڕاست/ **هەڵوەری خونچەی بەهاری نەورۆز**
**با بگرین بەدڵ بە ئاوازو سۆز**

– سید جوهەر سید نوری سید علی (١٩٥٠- ٢٠٠٤)

لای چەپ/ **ئەی خاك دەخیلتم قەدری بزانە**
**برای شیرینم لەلات میوانە**

– عمر صدیق توفیق/ عثمان مەلا صدیق

لە ١٩٨٤ مردووە/ لە ١٩٨٢ شەهیدکراوە

لەسەر قەفەسەکەیان نووسراوە:

**ئەوە جێت دێڵم ئەی دایە بە عومری بیست و دوو ساڵە**
**لە بێم و ڕیشە وە دەرهاتم وەك لاولاو و گوڵی ژاڵە**
**لەسەر تابووتەکەم توخوا بڕێژە ئەشکی وەك زمڕووت**
**بگاتە لای خوا ئاهو هەناسەو گریەت و ناڵە**



**ڕێبواری بەڕێز مەڕوانە گڵکۆم**
**ئەزانی من کێم باپێت بڵێم خۆم**
**لاو بووم نەوجوان تا بڵێی لاو بووم   ئارامی گیان و ڕووناکی چاو بووم**
**نەمزانی لەپڕچەپکەری نا پاك   وازوبێ تاوان ئەم خاتە ژێر خاك**

– شەهیدی نەمر لقمان فتح الله صالح سعید

ساڵی ١٩٦٨ لەدایك بووەو لە ١٩٨٨ لە ئەمنی مەنسور لەسێدارە درا

لای چەپ/ **بۆیە هەر ئەبێ پشکۆی تۆڵەبم   قوربانی خاك و هی ئەم خۆڵەبم**

لای ڕاستی گۆڕەکە نووسراوە/ لقمان فتح الله خەڵکی دێی (جوڵحانە)، بەڵام لەدێی (باپیلان) بەدەستی خائینان گیراوەو ١٩٨٨/٣/٢١ لە سێدارە دراوە.

– شێخ فەرج شێخ سعید برزنجی ١٩٣٠- ١٩٨٩

لای ڕاست/ **وێنەم ببینن جار جار یادم کەن   دەستی هەژاری بگرن شادم کەن**

– شەهید جبار رجب عبدالله (١٩٥٤-١٩٨٤) شەهید کریا

لەسەر کێلەکەی نووسراوە/ **ئەی شەهیدان نامرێ ناونیشانتان**

لەسەر قەفەصەکەی نووسراوە.

**برای شیرینم شەهید کراوە   ماڵ لەکۆشی ئارامی دەرچوو**
**لە کەرتی شەهاب خوێنی ڕژاوە   پڕ بوو لەشێوەن وەی وەی وەرن ڕۆ ڕۆ بکەین**
**لە بیست و دووی هەشتا و چوار   بڵێن جبار ڕۆ**
**چاوی لەژین برا بە یەکجار   فەلەك چەرخت شکی جەرگم بڕاوە**

**برای شیرینم هیوای ژیانم   هەراسانم فەلك فیکرم نەماوە**
**ئەستێرەی گەشی بەری بەیانم   هەتا کەی فەلەك من زوڵمت بچێژم**
**ئەی برام پاش کۆچ کردنت   دڵ و گیانم و وا حەسرەت سووتاوە**
**چرای عالەم دەسووتێ وا بەدایم**
**چرای من بەیەك لەحزە کوژاوە.**

– الشهيد شێرزاد نجيب الله/ ١٩٨٤ شەهيد كرا

وەرزيشم گۆڕاو ڕووخا جيهانی    شەماڵێش زۆر زوو مردنی هانی
دڵێش بۆ ژينی چەرخی ژيانی    گەيشتە فەلك ناڵەو گريانی

تا پێش ماوەيەك زيندوو بوو ناوم    ئێستاش بم بينن لەكفن ئالآوم
مەگری دايە پێبكەنە تاوێ    چونكە شەهيدم گريانی ناوێ

– الحاج الملا عبدالحميد بن الحاج ملا مراد افندی/ ١٤١٢هـ كۆچی كردووە

لای ڕاست/ ايا عبدالحميد لقد    اثابك ربك المنان
ابتلهنا الى الرحمن    فارضنا لك الغفران
لای چەپ/ الله يوكون قريبنه    ربي او كتابي مستبينه
ربي او شفيع مذنبينه    باغشله بيني بودر نيازم

– جبار امين سالح (١٩٢٩- ٢٠٠٤)

لای ڕاست/ حەيفە حەيف چەرخی چەواشەی چەپ گەرد
مرازی هەڵكەوتووی ئەمرۆی ئێمەی برد
بادەی مردنت بەزۆر پێ نۆش كرد    رووی لەجيهانی كپ و خامۆش كرد
لای چەپ/ دوای مەرگی بەڕێز ميرزای پڕمايە
خۆزگە ئەم چەرخە هەڵبگەڕايە
خوايە ڕووی ڕەحمی لێ بدەرەوە    لە بەهشتی خۆت جێی بكەرەوە

– بشار جاسم علوان (١٩٨٦- ٢٠٠٢)

وضعت قبري على الطريق    واطلب الفاتحة من المارو الصديق



– محمد مجيد عبدالله (مدد ياشاه كسنزان )

لای چەپ/ تأهب للذي لابد منه    فأن الموت ميقات العباد
اترضى ان تكون رفيق قوم    لهم الزاد وانت بغير زاد
لای ڕاست/اما والله لو علم الايام    لما خلقوا لما غفلوا و ناموا
ليوم الحشر قد عملت رجال    فصلوا من مخافته وصاموا

– ڕێبوار عبدالله رشيد لە ١٩٨٨ كۆچی كردووە

با ڕەفيقانم بۆم بكەن هاوار    قەد نەكەن تەخسير لە گريەو زار

– شەهيد هۆشيار فائق شێخ الطالباني (١٩٦٦- ١٩٨١)

تەنيشتی چەپ/لەوەختی مەغريب دەنگێ هاتە گوێم
بێ هۆشی كردم نەمزانی لە كوێم
وريابوومەوە بە پرسياری چاك    وتيان شەهيد بو هشياری دڵپاك
تەنيشتی ڕاست/ خەبەری پێدام لەناكاوە    هۆشيار خنكا لەناو ئاوا
مەگەر ئەو ئاوە خڕی خاسەبوو    بۆ كوشتنی هۆشيار زۆر بەتاسە بوو

– الشهيد البطل ابراهيم صبری حسن لە ١٩٨٨ كۆچی كرد.

ئەی خاك تۆو يەزدان زۆر گەنج و جوانە
نەی دەی ئازاری غەريبە لەم گۆڕستانە

دايە گيان گەر من نەهاتم    ئيتر ماچكە چاوی هاوڕێی خەباتم
تكايە ئەی خاك ميوانت لاوە    تەمەنی ٢٥ ساڵە شەهيد كراوە
كوڕە لاوێكە پێت سپێردراوە    لە يادی مەكە ابراهيمی ناوە

– الشهيد ايوب حمه خورشيد له **١٩٨١** كۆچی كردووه.

لەسەر مەجەرەكە نووسراوە/ **ئیتر من مردم بووم بە نیشانە**

**بووم بەنیشانە بۆ تیرو تانە**

**لە باخچەی ئاواتی جیهان خونچەی ئەمەلی وەران**

**بای ئەجەل هاتوو بە پەنهان دەفتەری ژینمی دڕان**

**ئاخ بەختی ڕەشم سیس بوو گوڵی گەشم**

– الشهيد احمد مجيد شريف (**١٩٥٦- ١٩٨١**) لە تەهران شەهید بووە

لەسەر مجەرەكەی/ **ئەی خاك دەخیلتم قەدری بزانە ئازاری نەدەی احمد میوانە**

**ڕەفیقان مەپرسن زامی برینم غەرقی خوێناوم بێ بەش لەژینم**

**تیغی نامرادی بڕیویە جەرگم بوو بە لیمۆی زەرد شێوەی گوڵ ڕەنگم**

**تیشكی هەلاَتی ڕۆژی پێنج شەممە بوو بە ئاگری ناو جەرگی ئێمە**

**لەو ڕۆژەوە پشتت شكاوو ڕۆ ڕۆمە چونكە نازدار بوو كەس نەكالۆمە.**

– الشهيد طاهر عزيز محمد الزنكنه (**١٩٥٦- ١٩٨١**)

لەسەر مجەرەكە نووسراوە/ **بە كۆمەڵ وەرن بۆ سەر گۆڕەكەم**

**بە خوێن ڕژان سوور بوو كفنەكەم**

**كوردم و مەردم بە فیداتم تاودوا نەفەس**

**ئەو كوردەی خاوەن شەرف بێ خاكی خۆی نادا بە كەس**

– (ئازاد حسێن البرزنجی) لە **١٩٧٥** كۆچی كرد

لای چەپ/ **تەنها گوڵێك بوو لەباخی ژینا ئەجەل لەناكاو فرسەدی هێنا**

لای ڕاست/ **فەلەك مەرگمی بەفرسەت زانی دەوای دەردم هیچ كەس نەیزانی**



– نۆشێروان محمد خليفه لە **١٩٨٧** شەهید كراوە

لەسەر قەفەسەكەی/**شەرتە ئارامت ئارامی دڵ بێ هەتا لاشەكەم تێكەڵ بەگڵ بێ**

**یەكی ئەیلولی ساڵی هەشتاو حەوت ئە ستێرەی گەشی نۆشێروان كەوت**

* مێژووی كۆچ كردنەكەی بە شیعر نووسراوەتەوە

– دڵشاد محمد رسول **١٩٧٤** لەدایكبووە

لە **٢٠٠٣/٢/١٩** بە پیلانێكی بەعسی دەسگیر كراوە

و لە **٢٠٠٣/٤/٥** لەچیای حەمرین شەهید كراوە

لای ڕاست/

**میوانە میوانە كاكە دڵشاد میوانە میوانی نەجات و سەنگەر و سیروانە**

**مەگرین خەم مەخۆن مەبن بێ توانە شەهیدە شەهیدی كورد و كوردستانە**

لای چەپ/ **نادایە گیان مەڵێ ڕۆیشت بەبێ وەسێت**

**من لەڕێگای سەربەستیتان ئەم ڕێگایەم گرت**

– زینب عباس یاسین قادر عادل رحیم نامق

**١٩٨٨** كۆچی كردووە **١٩٨٨** كۆچی كردووە

لەسەر مەجەرەكەیان نووسراوە **ئەمەندە تاكە بە لوتف و چاكە...**

**هاواتای هەر نەبوو... لەسەر ئەم خاكە... بۆ كەس و كاری باوك و برابوو... بۆ تاریكی ژین شوعلەی چرابوو... وەك ڕۆژی هاوین دایم دیاربوو... داخی گرانم بۆچی وەها ون بوو بێ دەنگ و ورتە لە دونیا دەرچوو ئێمەی هەژاری خستە دنیای شین**

– صابر محمود علی لە **١٩٩٥** مردووە

لای چەپ/ **ئەگەر چی مردی قەد ناچی لەیادم**

**ئەكەم یادت بە یادی تۆوە شادم**

یەزدانی گەورەدا (ئەهرومەزدا، میترا، ئانا هیتاوە) پەیوەندی هەیە، بەڵام لە نێو کوردی یەزییدی تازییە باری تاکو حەوت ڕۆژ بەردەوام بووە لە ڕابردوودا[٨٩].

هەر لەبارەی تازیەباری لەلای کورد لە ناوچەی سنەو دەوروبەری کاتێك کەسێکیان لێ مردووە هەموو بەرگی ڕەشیان پۆشیوەو یان تۆڕی ڕەشیان بەسەردا کێشاوە.

لە کاتێکدا کەمردووەکەیان بۆ گۆڕ بردووە حەوت ژنی ڕەش پۆش کە هەر یەکیان چیلکێك ئاگریان شەمیان بەدەستەوە بووە لەپێش تەرمی مردووەکەوە بە ئارامی و هێمنی تا گۆڕستان بە شێوەیەکی نومایشی ڕۆیشتوونەو هەروەها تا سێ ڕۆژ تازیەدار بوونە، لەلایەکی تر لە نێو لورەکانیشدا جۆرێك موور هەیە پێی دەڵێن (گاو گریو) گریەو شیوەنێکی پیرۆزە کە پەیوەندی لەگەڵ پیرۆزایەتی (گا)دا هەیە، بەڵام لەلای کوردەکان زیاتر ناوبانگی (گابۆر) هەیە بەمانای گریانی بەدەنگ و بڵند کە ئەمیش ڕێو ڕەسمێکی تایبەتی بووەو... هتد[٩٠].

بێگومان ئەگەر بمانەوێ باسی نەریتی هەر هۆزێك و تیرەیەك بە جیا بکەین ئەوە پێویستمان بەکارێکی زۆر ورد دەبێ و زۆر دەخایەنێ، بەڵام گەشتەکەی ئێمە گەشتێکی خێرایە بەناو کەلتوورە جیا جیاکاندا، و مەبەستمان تەنها وەرگرتنی بیرۆکەیەك بوو لەسەر ئەو نەریتانەی کە لەکۆنەوە بە دیاردەی مردنەوە لکاون.

هەڵبەت ڕێوڕەسمی مردوو بەڕێ کردن لە پاش هاتنی ئایینی ئیسلامدا گۆڕاوەو هەر لە نێو ئیسلامەکانیشدا (سنە و شیعە) جیاوازی هەیە لە شێوازی بەڕێوەبردنی ڕێو ڕەسمەکە، بەڵام بەر لەوەی بچینە سەر باسی ئەو نەریتانە لای ئیسلام پێم باش بوو لەلای وێستگەی کوردە یەزیدییەکان بوەستین و باسی هەندێك لەو نەریتانەی ئەوانیش بکەین، چونکە یەزیدییەکان زۆر لە کەلتوورو فۆلکۆری تایبەتی خۆیانیان پاراستووەو سەرەڕای ئەوەی چینێکن لە کۆمەڵگای کوردی کە تا ئێستاش لە زۆر شوێندا دەستبەرداری ڕێو ڕەسمەکانی خۆیان نەبوونەو هەر ئەنجامی دەدەن.

(٨٩ ) ئاینی چەمەری و شیوەن، حەیران لوتفی، گ. رامان، ژ٥٥، هەولێر، ٢٠٠١.

(٩٠ ) سەرچاوەی پێشوو.



## داب و نەریتی مردن و تازیەباری لای ئیزیدییەکان:

لە بارەی یەزیدییەکانەوە چەندین وتار کەوتە بەردەستم، بەڵام ئەو وتارانە لە شێوازی باسکردنی نەریتەکاندا جیاوازیان هەبوو، هۆی ئەمەش بۆ کۆنی و تازەیی وتارەکان دەگەڕێتەوەو لەلایەکی ترەوە دیارە لەناو یەزیدییەکانیش جیاوازی هەیە لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر لە شێوازی بەڕێوەبردنی ڕێو ڕەسمەکانیان، جا ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین بەکورتی باسی ئەو نەریتانە بکەین کە پەیوەندی بەمردنەوە هەیە.

لەلای یەزیدییەکان کاتێ ئێزیدییەك دەکەوێتە گیانەڵآ، هەموو کەس و کاری لە دەوری کۆدەبنەوەو شێخیش دێتە دیتنی و کەمێك لەخاکی گڵکۆی شێخ ئادیٚ کەبەراتی پێ دەڵێن دەکاتە ناو ئاو و دڵۆپ دڵۆپ دەیکەنە دەمی و کە گیانی سپارد بەجوانترین بەرگ دایدەپۆشن و کفنی دەکەن و دەیخەنە سەر تەختەیەك و تاسێ ڕۆژ لەماڵ ڕایدەگرن، لێرەدا جێی ئاماژە پێدانە کە یەزیدییەکان ئەم نەریتەیان لە ڕابردوودا پەیڕەو کردبوو، بەڵام ئێستا ئەوانیش لەهەمان ڕۆژدا مردووەکانی خۆیان دەنێژن و نایهێڵنەوە بۆ سێ ڕۆژ، بەهەر حاڵ پاش ئەوەی مردووەکەیان کفن دەکەن دەیبەن بۆ گۆڕستان و کەس و کاری مردووەکە بەشیوەن و ڕۆ ڕۆ و قەواڵەکان بەنوای دڵتەزێن و شمشاڵ ژەندن لەگەڵ خەڵك دەڕۆنە گۆڕستان و دەیسپێرنە خاك[٩١].

لە بارەی شوشتن و کفن کردنی یەزیدەکانەوەش گوایە ڕەوشتی یەزیدەکان وایە هەموو یەزیدەیەك ئەبێ برایەك و خوشکێك لە چینی ئایینی بۆ خۆی دیاری بکات کاری خۆیی بەرەو ڕووی ئەوان بکاتەوە لەڕۆژی پاش مردنیشدا ئەو دوانە بۆیی بپاڕێنەوە لەخوا کە بیبەخشێ لە گوناهەکانی و بەنیازی خۆشی بگەینێ. ئەو دوو خوشك و برا تا سەرەی مردووەکە دەبێ لە ڕۆژی مردنیدا یارمەتی شێخ بدەن لە شووشتن و پێچانەوەی لەشیا بە سپیاڵ. یەزیدیەکان لاشەی مردووەکانیان دەشۆن و زۆر جار شوشتنەکە بە ئاوی گەرم و سابوون دەبێ و ئەوەی مردووەکە دەشوات (شێخ) یان (پیر)ەکەیەتی و خوشك و برا ئایینییەکەش یارمەتی پیرەکە دەدەن لە شووشتنی مردووەکەداو کە لەشتنی مردووە دەبنەوە هەموو کونێکی لەشی بەلۆکە ئەگرن و تۆزێ لە خۆڵی گۆڕی شێخ (عدی)یش لەسەر ناوچەوانەکانی دادەنێین، پاشان مردووەکە بە سپیاڵێکی خۆماڵی دەپێچنەوە و نابێ هیچ سپیاڵێکی تر بۆ ئەم مەبەستە بەکاربهێنرێ، بەڵام ئێستا وازیان لەو نەریتە هێناوە، چونکە هەموو کات ئەو سپیاڵە خۆ

(٩١ ) ئێزیدیەکان، سدیق بۆرەکەیی، ڕامان، ژ٥٢، هەولێر، ٢٠٠٠.

کردیـەیان دەسـت ناکـەوێ پـاش ئـەوەش مردووەکـە دەبەنـە گۆڕسـتان و بـەرەو ڕۆژهـەڵات دەینێژن[٩٢].

ئێمە باسمانکرد کە جیاوازی هەیە لـەپێڕەوکردنی هەنـدێ نـەریت لـە نێـوان یەزیدییـەکان خۆیاندا، هەر بۆ نموونە ڕەوشتی یەزیدییەکانی لای سنجار وایە کە ژن یان پیاوێکیـان لێ مـرد ئەوە پرچی دەبڕن و بەکێلی گۆڕەکەیەوە هەڵی ئەواسن تا ئەڕزێ و لەناو دەچێ و ئەگەر بێـت و مردووەکە کچ بێت و لەهەرەتی شوکردندا بێ یاخود تازە شوی کرد بێ ئـەوە جـوانترین بـەرگی خۆی لەبەر دەکەن و ئینجا دەینێژن و هەندێکیان بەخشڵیش ئەی ڕازێننەوە، و ئەگەر مردووەکە پیاوێکی گەورەو پایەدار بێ ئەوە تا دەینێژن تفەنگی بۆ ئاگر دەدەن.

هەندێکیشان ڕەوشتیان وایە، کە مردووەکە مـرد جـل و بەرگـەکانی لەبـەر دەکـەن ئنجـا دەینێژن و کە ناشتیشیان دەیخەنە ناو پێخەفێکەوە کەلەناو گۆڕەکەدا دایاننناوە[٩٣].

دیارە ئیزیدییەکان لە تێکست و دوعاو بـەیتی فۆلکلۆریـشدا دەوڵەمەنـدن و یـەکێك لـەو دوعایانە دوعایەکە کەلەسەر گیانی مردوودا دەخوێنرێتەوە ئێمە لێرەدا یەك تێکستی دێنین بە نموونە، بەڵام تێکستی تریش هەیـە وەك (قولاسـەرە مـەرگێ) کـە تێکـستێکی زۆر درێـژە، و ناوەڕۆکی ئەو دوعایانەش هەمووی پاڕانەوەو نزایە لەبەردەمی خودا بۆ مردووەکـە بـۆ ئـەوەی بێبەخشێ هەروەها بۆ ئەوەی دواهەمین شت کە لەهزری مردووەکەدا بمێنێتەوە ناوی خودا بێت. دوعاکەش بریتییە لە:

یا خودێ هەر تووی و هەر توو دێ هەی، و هەر توو دێ هەبی
یاخودێ نەتوو ژ کەسی و نەکەس ژتەیە
ئێك فرواری، بێ شریکی، بێ هەڤاڵی
یا خودێ تەنەوەکیلە، ونە کەفیلە
توو وێ لگەل هەموو دەم و هەیام و بەدیلە
یا خودێ توو دشکینی و توو دجەبرینی
توو بەحرێت گران دمەیینی ڤێ دنیایێ ب کار دئینی

(٩٢ ) یەزیدیەکان و ئاینی یەزیدی، شاکر فەتاح، ؟ ، بەغدا، ١٩٦٩، ل٦٠-٦١.

(٩٣ ) سەرچاوەی پێشوو، ل٦١.



ڤی عەزمانێ بێ ستوون ڕادوەستینی توو بۆمە سەب و دینی
سەد خۆزکا ب وی گیانێ بدەیێ و ژێ نەستینی
دێ ب زۆر دەرەجا گەهینی
توو ڤێ مری ب رەحمینی
ئەم دکێمین و خودێ ی تەمامە[٩٤].

هەروەها لەمەڕ تازیەباری لەلای یەزیدییەکان، دیارە لە ڕابردووەوە تا ئێستا گـۆڕاوە، بـەڵام ئێستا تازیە سێ ڕۆژ دەخایێنی و لە نەریتە کۆنەکانیاندا ژنان و کچان ڕۆژی دووجار دەچنە سەر گڵکۆی مردووەکەو دەف و شمشاڵ لێ دەدەن و سرودی ئایینی دەخوێنەوەو بەشیوەن و گریانـەوە دەگەڕێنەوە ماڵ و پاش ئەو سێ ڕۆژە مەڕێك سەر دەبڕن و گۆشتەکەی لێدەنێن و دەیبەنە سـەر گڵکۆی مردووەکـەو مەبەسـتیش لـەو کـارە خێرکردنـە بـۆ مردووەکـەو چـونکە پێیـان وایـە مردووەکەیان پێویستی بە خواردەمەنی هەیە. هەروەها لەحەوتەم ڕۆژو لەچـلەو لـە ساڵانەشـدا دەچنە سەر گڵکۆی مردووەکەیان و خێر و خێرات دەکەن و یارمەتی هەژارو دەسـت کورتـەکان دەکەن و لەسەر گۆڕەکە چەند سرودێکی ئایینی دەخوێنن.

لـە بـارەی لاواندنــەوەش لەنەریتـە کۆنـەکانی یەزیدییەکانـدا پـاش مـەرگی هـەر کـام لەخۆشەویستەکانیان ئەسـپێکیان هێنـاوەو جـل و بـەرگ و کـڵاوو دەمانـچەی مردووەکـەیان خستۆتە سـەری.. هتـد. و لەمەراسـیمێکی تایبەتیـدا ئـەم کارەیـان ئـەنجام داوەو هـەر لـەو مەراسیمەشدا بۆ مردووەکەیان لاواندۆتەوە بۆ نموونە لەلاواندنەوەی باوکدا دەڵێن: لۆ باڤۆ لۆ بـا ڤۆ چما فەلەکێ هاکر؟ فەلەکێ سەرێ خوە ل من باکرە، باڤێ من مرییە، مالا مـن خـراڤ کـر! باڤۆ من بەلەنگازی، من سەفیلی، من سەرگەردان باڤێ مرییە ئەز بوومە سەفیل، باڤۆ، باڤتی تشتەکی چێیە، کوڕتی، باڤتی زەینەتە ڕوو عەردێیە، باڤۆ جەنت جەهەنەمە دەستی خوە دێیە! باڤۆ، تەیەکێ نەچێ کر، تەمالا خوە ژمالا من جهێ کر[٩٥].

ئێستا لەلای ئەوانیش ئەم جۆرە مەراسیمە زۆر پەیڕەو ناکرێ، بەڵام شـین و لاواندنـەوە لـە نێو تازییەکاندا هەر هەیە بۆ نموونە لەتازییەکانیاندا مجێورێك دێت و (قەولی مووسا پێغەمبەر)

(٩٤ ) دوعایا ل سەر گیانێ مری، بەهەڤکرن: شێخ عەلو خلف، گ؛ لالش ژ١٩، دهۆك، ١٩٩٨.

(٩٥ ) ئیزیدییەکان، سدیق بۆرەکەیی، ڕامان، ژ٥٢، هەولێر، ٢٠٠٠.

یان بۆ دەخوێنێتەوە کە چامەیەکی درێژەو سەرەتاکەی بەم شێوەیەی خوارەوە دەست پێ دەکات:

ڕۆژکێ ژ ڕۆژانە... موساوی دخونت کتێب و مشورانە عزراییل و جبراییل لە مەزەلا مووسا بوون مێڤانە ...هتد [96]. هەر وەکو باسیشمان کرد لەلای یەزیدییەکان چوونە سەر قەبران لە حەفتەو چلەو سالآنەی مردووەکە دایە جگە لەوەش یەزیدییەکانیش وەکو موسڵمانەکان زیارەتی پیاو چاکەکانی خۆیان دەکەن و ڕێزی لێ دەگرن و جێگا گرنگەکانی گۆڕی ئەو پیاو چاکانەش لە (لالش) و (عین سفنی) و (بەعشیقە)و (بحزانی) و (گوندەکانی سەرشاخی سنجار)ن و لە هەموویان گرنگتر پەرستگای (شێخ عدی)یە (ئادێ) لە چیایی (لالش) کە بە بەردەوامی یەزیدییەکان سەردانی ئەم گۆڕانە دەکەن و دوعاو نزای خۆیانی لێ دەکەن و نەخۆشەکانیشیان دەبەن بۆ ئەوێ بە مەبەستی چاك بوونەوەو... هتد.

دیارە وردەکاری زۆر ماوەتەوە لە مەڕ داب و نەریتی یەزیدییەکان کە بۆمان نەڕەخسا لێرەدا بە فراوانی باسی لێوە بکەین، بەڵام ئەوەی باسکرا وێنەیەکی گشتی بوو لەسەر ئەو نەریتانەی کە یەزیدییەکان پەیڕەویان کردووە، ماوەتەوە ئەوەش بڵێین لە نێو یەزیدییەکاندا قەد ناڵێن فلان کەس مرد، بەڵکو دەڵێن کراس گهۆڕی یان عەمرێ خودێ کر، هەروەها هەندێك جار لەشێوازی دروست کردنی گۆڕەکانیشیاندا جیاوازی هەیە. گۆڕەکانی ئەوان و بەتایبەتی گۆڕی پیاو چاکەکانیان سەر گۆڕێکی بۆ دروست دەکەن بە شێوەی پێنج لایەك یان بە شێوەیەکی قوچەکی و زیاتر بەڕەنگی سپی ڕەنگی دەکەن.

(٩٦ ) گوندایەتی ئالیکی ئەنثرۆپۆلۆجی، کۆمکرن و بەهڤکرنا؛ خدر سلێمان، چاپخانا (الحوادث) بەغداد، ١٩٨٥، ل١٢٣.



## داب و نەریتی مردن و تازیەباری لە نێو موسڵمانەکان

دیارە لەگەڵ هاتنی ئایینی ئیسلامدا بۆ کوردستان کۆمەڵێك شت گۆڕانی بەسەردا هاتووەو یەکێك لەو گۆڕانانەش داب و نەریتی مردوو ناشتن و تازیەباری گرتەوە، چونکە لەگەڵ هاتنی ئیسلامدا زۆر شت حەرام کراوو شتی نوێیش شوێنی گرتەوە. بە گشتی ئێستا ئەو ڕێو ڕەسمەی بەڕێوە دەچێ بەپێی ڕێو شوێنی ئایینی ئیسلامە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاسەواری هەندێك لە باوەڕەو نەریتە کۆنەکان ماوەتەوە، بەهەر حاڵ ئێمە هەوڵ دەدەین هەنگا بە هەنگاو باس لە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ئەو داب و نەریتانە بکەین کە لەگەڵ مردندا پەیڕەو دەکرێ لە نێو موسڵمانەکان.

**لەسەرە مەرگدا:**

کاتێك موسڵمانێك گیان لەدەست دەدا یاخود لە سەرەمەرگدا دەبێت قورئانی بۆ دەخوێنرێت و بەتایبەتی سوورەتی یاسین، و کەسە نزیکەکانی کۆ دەبنەوە لەدەوری و زۆرجار ئاو یاخود شەکراو دەکەنە دەم نەخۆشەکەوە یان ئەو کەسەی کە لە سەرەمەرگ دایەو هەوڵدەدەن دوا قسەی مردووەکە ببێتە (**اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله**) و بەین بەین ئەم شەهادەیە دەچرپێنن بە گوێیدا بەڵام ناکرێ زۆر دووبارەش بکرێتەوە تاکو بێزار نەبێ، بەم شێوەیە قورئانی بۆ دەخوێنرێ تاکو بە تەواوەتی گیانی لەدەست دەدا ئینجا چاوی مردووەکە دادەخەن تاکو شێوەی ناشرین نەبێت و پاشان خێرا دەنێرن بەدوای مردوو شوردا و لەلایەکی تر مەنجەڵی ئاو لێدەنرێ بۆ شووشتنی مردووەکەو خزمێکی ماڵی مردووەکە یان جیرانێکیان دەچێ و لە مزگەوت (تاتە شۆر) دێنێ واتە ئەو دارەی کەمردووەکەی لەسەر دەشۆرێ هەروەها بانگەوازیش لە مزگەوت دەکرێ لە هەندێ شوێن بەتایبەتی لە کەرکووك بۆ ئەوەی خەڵکی گەڕەکەکە کۆ ببنەوە بۆ مەبەستی ناشتن، لەم کاتەشدا گریان و شین بەسەر مردووەکەدا دەستێ پێ کردووە ئەگەرچی لای ئیسلام لە خۆدان و هاوار و خۆڕنینەوە حەرام کراوە، بەڵام هێشتا هەندێك ئافرەت هەیە کە فیزاح دەکات و لە خۆدەداو هەروەها لەو کاتەی کە مردووەکە گیانی لەدەست دەدا دەکرێ کەس و کارەکەی ماچی کۆتایی بکەن، بەڵام ئەگەر کفن کرا جائیز نییە سەر کفنەکە هەڵدرێتەوەو مردوو ماچ بکرێ چونکە واباوە ئەگەر یەکێك مردوو ماچ بکات

ئەوە مردووەکە هەرگیز نایەتە خەوی یان ئەگەر ڕەگەزیان جیابێت مردووەکە دەست نوێژی دەشکێ، بەڵام ڕۆدینکۆ لەم بارەوە ڕایەکی تری هەیە، ئەو دەڵێ: بیرو باوەڕێك هەبووە لەپێش ئیسلام لەلای کورد گوایە ئەگەر مردوو ماچ بکرێ ئەوە ئەو مردووە هەرگیز زیندوو نابێتەوە، ئەمەشی کردۆتە بەڵگەی ئەوەی کوردیش پێش ئیسلام باوەڕی بە زیندوو بوونەوە هەبوو)[97]. بە هەر حاڵ پاش گیان لەدەست دان مردووەکە حازر دەکرێ بۆ شووشتن و ئاو گەرم دەکرێ و تاتە شۆر دەهێنرێ و مردوو شۆڕیش حازر دەبێت و ئەو مردوو شۆرەش دەبێ شارەزایی هەبێت لەمردوو شۆردن.

## چۆنیەتی مردوو شووشتن:

لەکاتی شوشتنی مردوودا دوو کەس یان زیاتر خەریکی شووشتنەکە دەبن، مردوو شۆرەکەو یەکێك لەکەسوکاری مردووەکە یارمەتی دەر دەبێت. جا بەسابوون و ئاوی گەرم مردووەکە دەشۆرێ و ئەوەی کە ئاویش دەکا بەدەستی مردوو شۆرەکەدا دەبێ لەسەری مردووەکەوە ئاوەکەی پێیدابکات تاکو خوارەوەی پێی و نابێ لەنیوەدا دەستی بگەڕێنێتەوە ئەمەش بە مەبەستی پاکبوونەوەی تەواوی لەشی مردووەکەیە. مردوو شووشتنیش شێوازی تایبەتی خۆیی هەیەو دەبێ مردوو شۆر بیزانێ و سەرەتا لەلای ڕاستەوە دەست پێ بکات و پاشان لای چەپ بشوات و هەندێ جار لە ئاوی کۆتاییدا میسك یا گوڵاو تێکەڵی ئاوەکە دەکرێ و بەسەر مردووەکەدا دەکرێ و پاش ئەوەش مردووەکە وشك دەکرێتەوە جا بە لۆکە بێت یان خاولییەکی بە نوێژو پاك بێت، ئەوەش لەبەر ئەوەی دەست نوێژ بە مردووەکە هەڵدەگرن لەکۆتایی شووشتنەکەدا ئینجا مردووەکە بۆ کفن کردن حازر دەکەن.

## چۆنیەتی کفن کردنی مردوو:

هەندێ خاڵ هەیە لەلای ئیسلام جەختی لەسەر کراوە لەکفن کردنەکەدا یەکێك لەو خاڵانەش کە زۆربەی زانا ئاپینییەکانیش جەختیان لەسەر کردووە ئەوەیە کە پێیان باشە مەسرەفی کفنی مردووەکە لە پارەی تایبەتی مردووەکە خۆیی بێت و ئەگەر مردووەکە پارەی

(97) لاوانەوەی کوردی و دەوری ڕۆدینکۆ لە تۆمارکردنیدا، جەلال تەقی، گ؛ کاروان، ژ51، هەولێر، 1986.



نەبوو ئەو کات دەکرێ کەسوکاری یان خێرخوازێك کفنەکەی بۆ بکات جگە لەوەش پێیان باشە ڕەنگی کفنەکە سپی بێ و لە لۆکە دروست کرابێ و کفنی پیاو لەسێ بەرگدا بێت و کفنی ژن لە پێنج بەرگدا بێت، هەروەها ئەگەر بکرێ گوڵاو بخرێتە سەر کفنەکە باشەو ئەگەر دەست نەکەوت کێشە نییە،و ئەگەر مردووەکە لە حەج مردبوو ئەو بەجلی حەجەکەوەی کفن دەکرێت...هتد[98].

بەڵام ئەوەی ئێستا باوە لە کفن کردنی مردوودا قوماشی خام بەکاردەهێنن و باشتر وایە بێ مەقەس خامەکە پارچە پارچە بکرێ و نابێ کفن بدروێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ شوێن کفن بەدوورایی و بە حازری هەیەو بەگشتی ئەو پارچە خامە دەکرێ بە پێنج پارچەوە یان بە حەوت پارچەو بەپێی باڵاو تەمەنی مردووەکە درێژایی پارچەکان دەگۆڕێ، بەڵام مەبەستی سەرەکی لە کفن کردندا شاردنەوەی هەموو بەشێکە لە لەشی مرۆڤەکە، جا ئەگەر مردووەکە ئافرەت بێت پارچەیەك لە خامەکە دەکرێ بە لەچك بۆی و پارچەیەکی تر دەکرێ بە دەرپێ و هەندێ جار دەست کێش و گۆرەویشی بۆ دروست دەکرێ هەر لەو خامە و پاشان بە خامێکی گەورە دایدەپۆشن و ئەمسەرو ئەوسەری خامەکە دەبەستنەوە بە پارچە قوماش کە هەر لەخامەکە کردوویانەتەوە، دیارەو وردەکاری چۆنیەتی کفن کردنیش لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر هەروەها بەپێی تەمەن و ڕەگەز دەگۆڕێ، بەڵام بەگشتی کفن کردن واتە پێچانەوە یاخود داپۆشینی مردووەکەیە بە پارچەیەك قوماش و پاش کفن کردنیش بۆ دواجار لەبن گوێی مردووەکەدا بانگ دەکەن و دەڵێن (تۆ موسڵمانی و لەسەر دینی محمدی ولامی خۆت باش بدەرەوە) هەروەها جێی ئاماژە پێ کردنە کە باسی شەهیدیش بکەین، چونکە شەهیدی شەڕ کفنی بۆ ناکرێت و ناشۆردرێت و بەگشتیش شەهید کفنی بۆ ناکرێ، بەڵام ڕای تر هەیە کە داوای شووشتن و کفن کردنی شەهید دەکات جا ئەم ڕایانەش بەپێی مەزاهیبەکان دەگۆڕێ.

## بەڕێ کردنی مردوو:

پاش کفن کردن مردووەکە لە بەتانییەکی پاك لوول دەدرێ و دەکرێتە ناو تابووتەوە، تابووتەکەش هەر لە مزگەوتەوە دەهێنرێ جا چوار پیاو یان زیاتر لەسەر شانیان تابووتەکە هەڵدەگرن و کە دەگەنە لای دەرگای ماڵەکە سێ جار یان حەوت جار مردووەکە هەڵدەگرن و

(98) صحيح فقه السنه، ص٦٣١-٦٣٢.

دایدەنەنەوەو لەگەڵ هەڵگرتنەکەدا دەڵێن (اللهم صلی علی سیدنا محمد) یاخود دەڵێن (نوری پاك پێغەمبەر الصلوات) گوایە ئەم هەڵگرتن و داگرتنەش بە مەبەستی گەردەن ئازادییە تاکو ئەجری دراوسێی لەسەر نەمێنێ، جا لەو کاتەشدا خەڵکی کۆبۆتەوەو پیاوان بە ئۆتۆمبێل ئەگەر گۆڕستانەکەکە دوور بێ بەپێ ئەگەر نزیك بێت مەیتەکە دەبەن سەرەتا بۆ مزگەوت و پاشانیش بۆ گۆڕستان یاخود ڕاستەوخۆ بۆ گۆڕستانی دەبەن، ژنانیش بەگریانەوە لە دەرگای حەوشەوە ماڵ ئاوایی لە مردووەکە دەکەن. بەر لەوەی بێینە باسی نوێژی جەنازە چەند شتێك ماوە پێویستە ئاماژەیی پێ بکەین ئەویش هەندێك داب و نەریتە کە لەهەندێ شوێندا ماوە بۆ نموونە (لەناو کاکەییەکانی ناوچەی گەرمیان وا باوە ئەو کاتەی تەرمی مردووەکە لە ماڵ دەهێننە دەرەوە سێ نانی بتوون بە ڕیزەوە لە پێش تەرمەکەدا دادەنێن هۆی ئەنجامدانی ئەم کارەش بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە گوایە هەر مردوویەك کە لە ماڵ دەربکرێ لە غەیبەوە بەنهێنی سێ سەگ بەتاو دێن بۆ ئەوەی ئەو مردووە بخۆن جا گوایە ئەو نانانە بۆ ئەو سەگانەیە چونکە هەتا سەگەکان خەریکی نان خواردن دەبەن... تەرمەکە لە حەوشەکەدا دەردەچێ و هەرکە مردووەکە لەحەوشەکە دەرچوو ئیتر سەگەکان حەقی ئەوەیان نییە بیخۆن و ناکەونە دوای ) و هەندێکیش دەڵێن ئەم نان دانانە لە پێش تەرمەکە لەبەر ئەوەیە کە مردووەکە چاوی خێری بەدوای خێزانەکەیەوە بێت تا نەبێتە هۆی نان بڕاوییان واتە چاوی بەدوای زەخیرەیانەوە نەبێت[٩٩].

دیارە داب و نەریتی تر لەم جۆرە زۆرە هەر لە کوردەواریدا باوە گوایە ئەگەر منداڵێك بمرێ (پەلەوەر مریشك یان کەڵەشێرێك) سەر دەبڕن و سەری مریشکەکە لەگەڵ مناڵەکە دەخەنە ناو گۆڕەوە تا کەسی تر لەو ماڵە نەمرێ[١٠٠].

هەروەکو وتمان لەم جۆرە نەریتانە زۆرەو بەتایبەتی لە نێو شیعەکاندا باوەڕی وا زۆرەو بەگشتی سەرچاوەی ئەم هەڵسوکەوتانەش هەمووی ئەو حیکایەتە خورافیانەیە کە خەیاڵی مرۆڤ دروستی کردووەو لێکیداوەتەوە تاکو بەرە بەرە بۆتە نەریت.

(٩٩) ڕێ و ڕەسمی شین و لاوانەوەی کوردی، د.شکریە ڕەسول، هەولێر اوفیست، ١٩٩٧، ل٢٩-٣٠.

(١٠٠) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨.



## نوێژی جەنازەو مردوو ناشتن:

نوێژی جەنازە پێش مردوو ناشتنە، لەلای ئیسلام هەر کەسێك نوێژ لەسەر مردوو بکات ئەوە ئەجری بۆ دەنووسرێت و نوێژی جەنازەش بە پێوە دەبێ و بە جەماعەتەو باشترە ئەوانەی کە نوێژ دەکەن لەسێ ڕیزدا بوەستن هەتا ئەگەر ژمارەشیان کەم بوو و ئیمامەکەش لە پێشیان دەوەستێ و لەلای سەری مردووەکەوەو نوێژ دەست پێ دەکات و هەرچی شەرتی نوێژەکانی ترە بۆ نوێژی مردووش شەرتە تەنها ئەوەندە نەبێ لە نوێژی مردوودا پاش نیەت هێنان چوار جار (الله اکبر) بانگ دەکرێ و لە کۆتایشیدا دوعا بۆ مردووەکە دەکرێ تێکستی دوعاکەش وەك چۆن وەرمگرتووە (اللهم اغفر لحینا ومیتنا وشاهدنا وغائبنا وذکرنا واناثنا اللهم من احیته فأحییه علی الاسلام ومن توفیته فتوفه علی الایمان)[١٠١].

جا پاش تەواوبوونی نوێژ گۆڕ حازر کراوەو بۆ ناشتنیش باشتر وایە یەکێك لە کەسوکاری مردووەکە دابەزێتە ناو گۆڕەکەو ئەگەر ئافرەت بوو باشترە مێردەکەی بینێژێ یان باوکی یان برای و زۆر جاریش لەکاتی ناشتنی ئافرەتدا بان گۆڕەکە دەدەن بە قوماشێك یان هەر شتێکی تر و هەروەها ئەوەی کەمردووەکە دەخاتە گۆڕەوە پاش ئەوەی تەواو بوو سێ جار مشت لە خۆڵی سەر گۆڕەکە دەنێ و هەر لە بارەی ناشتنەوە ڕای وا هەیە دەڵێ پەسەند نییە مردوو لەکاتی ڕۆژهەڵات و نیوەڕۆو مەغریبدا بنێژرێ تەنها لەبەر زەرورەت نەبێ.

هەروەها سونەتە ئەوەی لە قەراغی قەبرەکەدا بێت بەر لە پڕکردنەوەی گۆڕەکە بە خۆڵ سێ مشت خۆڵ لە خۆڵی گۆڕەکە هەڵگرێ و بەسەر یەکەمیانا (منها خلقناکم) و بەسەر دووەمیاندا (ومنها نعیدکم)و بەسەر سێیەمیاندا (ومنها نخرجکم تارة اخری) بخوێنێ و لە پاشان ئەو مشتە خۆڵانە یەکە یەکە بکاتە خوارەوە بۆ لای سەری مردووەکە[١٠٢].

هەر لە مەڕ ئەو داب و نەریتانەی کەلەسەر گۆڕدا باون (ڕۆدینکۆ) باس دەکات و دەڵێ گوایە لە کاتی هەڵکەندنی گۆڕ خاکەناس لەیەکێکەوە نادرێتە دەست یەکێکی تر بەڵکو لە پێشدا دادەنرێ پاشان ئەوی تر هەڵیدەگرێتەوە هۆی ئەمەش گوایە کورد وای لێکداوەتەوە کە ئەو ئامێرەی گۆڕەکەی پێ دا دەپۆشرێتەوە بەشێك لە گوناهی مردووکەو روحیانەتی خراپی دەوروبەری پێوە دەلکێ جا ئەگەر درایە دەست یەکێ تر ئەو گوناهەو روحە. . . خراپەکان

(١٠١) سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

(١٠٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.

لەرێی ئەو کەسەوە ئەچێتەوە بۆ مردووەکە، بەڵام ئەگەر خرایە سەر زەوی ئەوە خراپە و گوناهەکان دەچێتە زەویەکەو لە مردووەکە دوور دەکەوێتەوە[١٠٣].

ئەم نەریتانە جێ دێڵین و جارێکی تر دەگەڕێینەوە سەر مردووەکە، پاش ئەوەی گۆڕەکەی پڕ کرایەوە بە جوانی، بەردێك لەلای سەری دادەنرێ بۆ ناسینەوەی گۆڕەکە و لەلای هەندێ خەڵك حەوت بەردی بچووکیش بەڕیزەوە لەسەر گۆڕەکە دادەنەن، پاشان ئیمام لەلای سەری دادەنیشێ و تەلقینی مردووەکە ئەداو ئەوانی تر بە پێوە دەبن لە تەلقینی مردووشدا دەڵێ: (یا عبدالله ابن امة الله اذكر العهد الذي خرجت عليه من الدنيا، وهو شهادة ان لا إله إلا الله وحده لا شريك له وان محمد رسول الله وان الجنة حق وان النار حق وان البعث حق، وان الساعة اتية لاريب فيها وان الله يبعث من القبور وانك رضيت بالله ربا و باالاسلام دنيا، وبمحمد (ص) نبيا ورسولا، وبالقرآن امام وبالكعبة قبلة والمؤمنين اخواناً ربي الله لا اله الا هو عليه توكلت وهو رب العرش العظيم) ئەمە سونەتەو سێ جار دووبارە دەکرێتەوە[١٠٤].

دیارە لێرەدا پێویستە باسی کاریگەری هزری نەتەوایەتی بکەین لەسەر شێوازی بیرکردنەوەی زۆربەی تاکەکانی کورد، هەر بۆ نموونە لەبەر ئەوەی عەرەب هەمیشە زوڵمی لەمیللەتەی کورد کردووەو کورد ژێر دەستە بووەو ڕێیان پێ نەداوە زمانی خۆیی بەکاربێنێ بۆیە بیری کردۆتەوە لەوەی کە تێکستە ئایینییەکانیش بکاتەوە بە کوردی، جا زۆرجار ئەو پرسیارەشیان لا دروست بووە، ئایە بۆ تەلقینی مردووەکانیان بە عەرەبی بێت و بۆ بەکوردی نەبێ، و زیاتر ئەم مەسەلەیە لە نێو شیعری شاعیرەکاندا هەست بەبوونی دەکرێ بۆ نموونە (هەژار)ی شاعیر شیعرێکی هەیە (تەلقین بە کوردی) هەروەها زۆری تریش لە شاعیران داوای تەلقینکردنیان کردووە بەکوردی پیرەمێرد لە چەند دێرێکدا دەڵێ:

ئێمە کەکوردین لەلامان وایە
کوردی زبانێکە زۆر بێ هاوتایە
ناوی پێغەمبەر حەمەی رەسولە
نوێژمان بە کوردی لای خوا قەبوڵە

(١٠٣) لاوانەوەی کوردی و دەوری رۆدینکۆ لە تۆمارکردنیدا، جەلال تەقی، گ؛ کاروان، ژ٥١، هەولێر، ١٩٨٦.

(١٠٤) ڕێ و ڕەسمی شین و لاوانەوەی کوردی، ل٣٤.



ئەگەر تەلقینم بە کوردی نەدرێ
گوێی لێ ناگرم با کفنم بدرێ[١٠٥].

بەهەر حاڵ تەلقینکردن ئێستاش لەسەر گۆڕەکان هەر بە عەرەبییە جا پاش تەلقینکردن یەکێك لەو پیاوانەی کەلەسەر قەبرن دەڵێ: کەس هەیە شایەدی بۆ ئەم مردووە بدات کە مرۆڤێکی چاك بووە و لەسەر دین بووە...هتد. خەڵکەکەش دەڵێن بەڵێ، ئەویش دەڵێتەوە مادام وایە گەردنی ئازاکەن، جا ئەوانەی لەسەر قەبرن دەست بەدوعا دەکەن بۆ مردووەکە و رەحمەتی بۆ دەنێرن، و هەر یەکێك لەکەسوکاری مردووەکە بە خەڵکەکە ڕادەگەێنێ کە تازیە لە فلانە جێگا دەبێ، ئنجا گۆڕستان چۆڵ دەبێت و بەرەو ماڵی مردووەکە دەچنەوە، شایەنی باسە مردوو شۆرو گۆڕ هەڵکەن جاران هیچ پارەیان وەرناگرت و ئەم کارەیان لە ڕێی خوا دەکرد، بەڵام ئێستا ئەوەش بۆتە پارە.

**پرسە:**

لە نێو ئیسلامدا کۆبوونەوە بە مەبەستی تازیە گرتن پەسەند نییە، بەڵام کەس ئەو ڕایە پەیڕەو ناکات و نەریتی تازیە دانان هەر هەیە، جا تازیەی پیاوان بە جیایەو هی ژنانیش بەجیا دەبێت. بەزۆری تازیەی پیاوان لە مزگەوت دەبێ لەپاش نیوەڕۆ و سبەینانیش لەماڵ و هەندێ جار و لەهەندێ شوێن ڕشماڵ هەڵدەدرێ ئەوەش ئەگەر تازیەکە گەورەبێت و شوێنی خەڵکەکە نەبێتەوە، تازیەیی ژنانیش لە ماڵەوە دەبێ، بەڵام ئەمە شەرتیش نییە، چونکە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ئەم هەڵسوکەوتانەش لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆڕێ، بەگشتی تازیە سێ رۆژی بۆ تەرخانکراوە، ئەگەرچی ئێستا لەزۆر شوێن کراوە بەدوو ڕۆژ بۆ نموونە لە سلێمانی تازیە کراوە بەدوو ڕۆژ هەندێ خەڵك لە کەرکووکیش کردوویانە بە دوو ڕۆژ جگە لەوەش لە سلێمانی هەندێ جار تازیەی ئافرەتیش لە پاش نیوەڕوانان دەبێ لە مزگەوت، بەڵام بەزۆری لە ماڵی مردووەکە دەبێ هەروەها وەکو نەریتێکی تازییە دەبێ ئاوو چایی یان قاوە بگێڕدرێ بەسەر میوانەکاندا ئەوەش لەسەر لایەنی ئابووری ماڵی مردووەکە دەوەستێت، بەڵام ئێستا خەڵکەکە فێربووە لە تازیەدا کە مەولود بۆ مردووەکە دەکا لە دووەم یا لەسێیەم ڕۆژدا پەقلاوەو بیبسی یان شەربەت دەگێڕن بەسەر خەڵکەکەداو ئەم نەریتەش بەتایبەتی لای

(١٠٥) پیرەمێردی نەمر، ل٦١.

سلێمانییەکان باوە، زۆر جاریش لە سێیەم ڕۆژی تازیەدا گولاو دەکرێ بەسەرو دەستی میوانەکاندا ئەم نەریتەش لای پیاوان و لای ژنانیش پەیڕەو دەکرێ و نیشانەی کۆتایی هێنانە بە تازییەکە، لە تازیەی پیاواندا مەلا بانگ دەکرێ و قورئان دەخوێنری و لە تازیەی ژنانیش زۆر جار مەلا بانگ دەکرێ و زۆر جاریش مەلاکە ئافرەتە قورئان دەخوێنێ و نەسیحەتی ئافرەتەکان دەکاو حیکایەت دەگێڕێتەوە لەسەر پێغەمبەر (د.خ) و لەسەر ئەسحابەکان، خواردنی تازیەش لە ماڵی مردووەکە خۆیی ئامادە دەکرێ، بەڵام لە هەندێ ناوچەش وەك پشدەرو کۆیەو زۆر لەگوندەکانیش هەستی هاریکاری کردنی ماڵی مردووەکە لە ئارادایە جیران و خەڵکی گوندەکە ناهێڵن ماڵی مردووەکە هیچ کەن، بەڵکو ئەوان خواردن دەکەن بۆ ژنان و بۆ پیاوانیش هەر ڕۆژی و ماڵێك دەیکا، بەڵام وردە وردە ئەو هەستی هاریکارییە لە نێو خەڵکی نامێنێ و بەرەو لەناوچوون دەچێ، بەڵام بە گشتی جیرانەکان یارمەتی یەکتر دەدەن لەتازیەدا و ئەگەر قاپ و سینی و... هتد. کەم بکا لەماڵی جیرانەوە دەیهێنن و... هتد. لە تازیەی پیاواندا کەسە نزیکەکانی مردووەکە لەلای دەرگاوە دادەنیشن و خەڵکەکە سەرخۆشیان لێ دەکەن و دەڵێن (خۆتان خۆش) (دوایین ناخۆشیتانە ئینشا و الله) (خوا عەفوی کاو عەمری درێژی بۆ ئێوە جێ هێشتبێ)... هتد. بەم شێوەیە هەتا تازیە تەواو دەبێ و خاوەن تازییەکە ڕیشیان دەهێڵنەوە وەکو نیشانەیەکی تازییە باری هەتا ماوەیەك لەدوای تازیەکەش نایتاشن.

لە تازیەی ئافرەتیشدا ئافرەتەکان ڕەش دەپۆشن و لەچکی ڕەش دەدەن پەسەرا نیشانەی تازیە باری و دەگرێین و دەلاوێننەوە و هەندێ ئافرەتیش لە خۆ دەدەن و پرچ دەڕننەوە، بەڵام وەك وتمان ئەو نەریتانە حەرامە لە نێو ئیسلامدا، ئەو ئافرەتەی کە سەرەتا دێتە ناو تازییەکەوە پاش سەلام کردن دەڵێ: (دەستم شکێ بۆ فلانە کەس چەن چاك بوو یان چەند گەنج بوو) کەسوکاری مردووەکەش دەڵێن خوا نەکا (دەستی خۆمان شکێ) و پاشان یەك دەڵێ (الفاتحە) و فاتحە دەخوێنن و هەندێ ئافرەتیش بە لاواندنەوە و لە خۆدان دێنە ناو تازیەکەوە و کەسوکاری مردووەکەش بەهەمان شێوە پێشوازی لێ دەکەن و لە سێیەم ڕۆژی تازییەکەدا مەولوود دەکەن و خواردن دەبەخشنەوەو خەڵکی سەر خۆشی لەماڵی مردووەکە دەکەن (خۆتان خۆش بن) و (چیتر ناخۆشی نەبینن) بەو شێوەیە تازیەکە تەواو دەبێ.

لە هەندێ شوێن وا باوە کە لەهەر سێ ڕۆژی تازییەکەدا بەیانیان زوو پێش نان خواردن کەسوکاری مردووەکە دەچنە سەر قەبران و گۆڕی مردووەکەیان ئاوەڕشێن دەکەن و زۆرجار ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبێت یان هەر کەسێکی تری نزیکی کە زۆر بگریی بۆی و مردنەکە



کارێکی زۆری کردبێتە سەری ئەوە لەو کاتەدا یەکێك لەکەسوکاری مردووەکە هەندێك خۆڵ هەڵدەگرێ لەسەر گۆڕەکەو دەیکا بەسەر منداڵی مردووەکە یان بەسەر خێزانەکەی یا (بەسەر برا یا خوشك)ی مردووەکەو مەبەستیش لەم کارە گوایە ئەو خۆڵەی سەر قەبرەکە سەبوری دەبەخشێ بە کەسەکەو هێمنی دەکاتەوە. هەروەها یەکەم پێنج شەمی دوای مردنی کەسەکەیان کەسوکاری مردووەکە دەچنەوە سەر قەبران و هەروەها لەچلەو لە ساڵانەشدا، و هەتاکو ساڵێك ماڵی مردووەکە ڕەنگی ڕەش لەبەر دەکەن یان ڕەنگی تۆخ کە نیشانەی تازییە باریە، بەڵام ئێستا وردە وردە ئەو نەریتانە کەم تر پەیڕەو دەکرێ و بەرەو لەناوچوون دەچێ.

## چوونە سەر قەبران:

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموویێ (کنت نهیتکم عن زیارة القبور فزورها (تذکرکم الاخرة))[١٠٦]. واتە: لەسەرەتاوە جائیز نەبووە زیارەتی گۆڕستان بکرێ، بەڵام پاشان ڕێی پێ دراوە بۆ ئەوەی ئاخیرەت بهێنێتەوە بەبیری خەڵکیداو تاکو هەردەم لەبیریان دەرنەچێ کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوانیش دەمرن و جێگایان گۆڕ دەبێ.

سەرەتا وەکو وتمان چوونە سەر قەبران لەچلەو لە ساڵانەی مردوودا دەبێت و لەو یادانەدا خێر دەکرێ بۆ مردووەکە، بەڵام بە شێوەیەکی بەردەوامیش زیارەتی قەبرستان دەکرێ و بەتایبەتی ئەو زیارەتانە لەڕۆژی پێنج شەموان دەبێ یان هەینی یان دووشەممە جا لە کەرکووك و هەولێر بەزۆری پێنج شەمووان خەڵکی دەچنە زیاترەتی مردووەکانیان لە گۆڕستان، و لە سلێمانی و دهۆکیش وەکو تێبینم کرد زیاتر هەینی دەچنە زیارەتی گۆڕستان.

هەروەها لە چلەدا گۆڕ هەڵدەگرترێ جا بۆ ئەم مەبەستە چەند پیاوێك لەگەڵ کارە کەرێك دەڕۆنە سەر قەبران و قەبری مردووەکەیان هەڵدەگرن هاوکات لەماڵەوە حەیوان سەر دەبڕن یا خواردن دەکەن و دەیبەخشنەوە بەسەر دراوسێ و هەژارەکانداو ئێوارەی هەمان ڕۆژ ئەگەر پێنجشەممە بێ یان هەینی بێ ژنان دەچنە سەر قەبران و شیرینی لەگەڵ خۆیاندا دەبەن (لوقم، جوکلێت، نوقڵ.. هتد). لەسەر قەبران دەیبەخشنەوە گوایە مردووەکەیان لە لێپرسینەوەی ناو گۆڕ نەجەتای بووە بۆیە خێری بۆ دەکەن.

---

(١٠٦ ) صحيح فقه السنه، ص٦٦٨.

چوونە سەر قەبرانیش هەندێ ڕێ و ڕەسمی تایبەتی هەیە بە خۆیەوە بۆ نموونە دەبێ ئەوانەی کە دەچنە سەر قەبران بە پاکی بڕۆن و زۆرجار دەست نوێژیش دەشۆن و ئافرەتان لەچك دەکەنە سەریان و بخور لەگەڵ خۆیاندا دەبەن یان گوڵ بۆ مردووەکانیان دەبەن، و لە داب و نەریتەکانی چوونە ناو قەبرستان دەبێ سەرەتا سەلام بکرێ (السلام علیکم یا اهل الحق انتم السابقون ونحق اللاحقون) یاخود (السلام علیکم اهل الدیار من المؤمنین انتم السابقون ونحن اللاحقون) و لەسەر قەبرەکە قورئان دەخوێنن زۆرجاریش قورئان خوێن بانگ دەکەن بۆ ئەم مەبەستە هەندێ جاریش کەسوکاری مردووەکە پارە دەدەن بە قورئان خوێنێك مانگانە تاکو هەموو پێنج شەمێك یان هەینییەك قورئان بۆ مردووەکەیان بخوێنێت هەتا ئەگەر خۆشیان نەچنە زیارەتی گۆڕەکە. نەریتێکی تریش کە زۆر باوە لەسەر قەبران دارچاندنەو بەپێی کەش و هەواو شوێنەکەش جۆری دارەکە دەگۆڕێ جا لەدیار سەری مردووەکەدا دار دەچێنن بۆ نموونە لە کەرکووك زیاتر داری زەیتون و قەڵەم تۆز بەرچاو دەکەوێ لە گۆڕستانەکان و لەگردی سەیوان دار ئەرخەوان و دار قەزوان و ڕازیانە زۆرەو لە شاخکی لە دهۆك داری بەڕوو زۆر بوو و لەهەولێریش دارەتوو زەیتون و قەڵەم تۆزو... هتد. جا هەموو پێنج شەمێکیش دەچنە سەر قەبران و ئەو دارانە ئاو دەدەن. هەروەها نەریتێکی تر کە تەنها لە گۆڕستانی سلێمانی بەرچاوم کەوت دەف لێدان و مەولوود خوێندن بوو لەسەر گۆڕەکان، چەند مەولوود خوێن و دەف لێ دەرێك لەگەڵ خزم و کەسی مردووەکەدا دەچنە سەر گۆڕەکەی و دەف و مەولوودی بۆ دەخوێنن.

جگە لەوەی باس کراش لە جەژنەکانیشدا (جەژنی رەمەزان و جەژنی قوربان) خەڵکی دەچنە سەر قەبران و جارێکی تر گۆڕستان پڕ خەڵك دەبێتەوە ئەوەش بەتایبەتی لە ئێوارەی جەژن یاخود لە بەیانیانی جەژن لە پاش نوێژی جەژنە بە بخورەوە خەڵکی دەچنە سەردانی مردووەکانی خۆیان.

لەلایەکی ترەوە چوونە سەر قەبران بۆ مەبەستێکی تریش ئەنجام دەدرێ. ئەویش زیارەتی پیاو چاکانە بە مەبەستی دوعاکردن و نزاو پاڕانەوە ئەم کارەش هەر پەسەند نییە لە نێو ئیسلامدا، بەڵام ئەو نەریتەش هەتاکو ئێستا هەر ماوە بەتایبەتی لای کوردە شیعەکان کەدەچنە سەر گۆڕی ئیمام عەباس و ئیمام عەلی و حەسەن و حسین لە کەربەلا و نەجەف و جگە لەوانیش زۆری تر ئەم هەڵسوکەتانە دەکەن و پاشان مەبەستی زیارەتەکانیش ڕوون دەکەینەوە.



دیارە گۆڕستان چونکە شوێنێکی خامۆشە چەندین حەکایەتی خورافی لەخۆ گرتووە و بوونی ئەو حیکایەتە خورافیانە تایبەتییەکی ترە لە تایبەتەکانی گۆڕستان، بۆ نموونە زۆرجار خەڵك دەترسێ بەشەوان بچێتە ناو گۆڕستان ئەمەش لەبەر ئەوەی گوایە روحی مردووەکان لەناو گۆڕەکانەوە دەردەچن و زیندووەکان دەترسێنن، و زۆری تریش دەبیستین لەو حیکایەتانە کە هەمووی لە خەیاڵی مرۆڤەکانەوە دروست کراوە، هەر لەو بارەوە زۆرجار دەبیستین کە گوایە فلانە گۆڕ بەشەوان ئاگری لێ دەردەچێ بە مانای ئەوەی مردووەکە سزا دەدرێ یاخود دەڵێن شەوانە گوێمان لە قیژەی مردووەکە دەبێت و... هتد. و هەر لەو حیکایەتانەش کە بۆ گۆڕ هەڵبەستراوە ئێمە هەوڵدەدەین چەند نموونەیەکی لێ باس بکەین، بەڵام ئەو جۆرە حیکایەتانە زۆر زۆرە لە ناو خەڵکیدا. بۆ نموونە لە سلێمانی باسی گۆڕی قادر بێ سەریان دەکرد کە لەگۆڕستانی گردی ناوەڕاستە گوایە ئەم گۆڕە کێل قەبوڵ ناکات و هەرجار کێلەکەی بۆ چاك بکەنەوە هەڵیدەتەکێنێ جا لەبەر ئەوە پێی دەڵێن قادر بێ سەر، و لە هەولێریش ئەم حیکایەتە هەیە گوایە گۆڕی سیتی ئیمام گومبەت قەبوڵ ناکات بۆیە گومبەتی بۆ دروست نەکراوە..هتد. هەر لەمەڕ ئەو حیکایەتانەوەش کە خەڵك دەچنە سەر گۆڕی مردووەکانیان و دەگرین دەڵێن ئەوە کارێکی باش نییە چونکە ئەگەر لەسەر قەبران بگرییت ئەوە چاوی مردووەکە پڕ لەئاو دەبێت و ئیتر ناتبینێ و ئەم باوەڕەش لە بادینانیشدا هەبووە بۆ نموونە دەڵێن ( هەکە مرۆڤ بچیتە سەر گۆڕی ئیکی نەکەتە گری، دێ- مری، مرۆڤی ببینت هەکە مرۆڤ کرە گری، دلێ وی ژی دێ مینیت و ئەو ژی دێ کەتە گری و چاڤ دێ لێ تژی روندك بن و نەشێت مرۆڤی ببینت: لو دڤیت مرۆڤ نەگریت، داکو مرین مرۆڤت، مرۆڤێ ببینت)[١٠٧]. هەر وەکو وتمان لەم جۆرە بیرو باوڕانە یەکجار زۆرە لەناو خەڵکی و ئەوەی جێی سەرسوڕمانە زۆر لە خوێندەوارەکانیش باوەڕیان بەو خورافاتانە هەیەو بە بڕوایەکی زۆرەوە دەیگێڕنەوە.

(١٠٧ ) هەندك کەڤنە باوڕێت خەڵکی ل بەهدینان، حجی جعفر، دەزگای رۆشنیبری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغداد، ١٩٩٣، ل٣٢.

## مەبەست لەزیارەتی پیاو چاك و ئەولیا:

ئێمە باسی زیارەتی خەڵکمان کرد بۆگۆڕ و مەزاری پیاوچاکان جا بابزانین ئەم زیارەتە چۆنەو بۆ چییە؟ دیارە مەبەست لەو زیارەتانە یا بۆ نەخۆشی چاکبوونەوەیە یاخود بۆ مراز حاصل بوونە جا هەرچییەك بێ مرازەکە شوکردن بێ ژن هێنان بێ یا ناجح بوون بێ... هتد. یاخود بۆ دوعاکردن جا بۆ هەر چ مەبەستێك بێت، هەروەها چوونە سەر گۆڕی هەر یەکێك لەو ئەولیانەش تایبەتمەندی خۆیی هەیەو بۆ مەبەستێکە، لە عێراقدا زیاتر خەڵکی دەچنە سەر گۆڕی غەوس لەبەغدا (شێخ قادری گەیلانی) یان (امام کاظم) یانیش بۆ سەر گۆڕی ئیمام (عەلی)و (حەسەن و حسین) دەچن یان بۆ زیارەتی (نەبی یونس) دەچنە موسڵ، بەڵام جگە لەوانیش گۆڕی پیاو چاکی تر هەیە کە بۆ نزاو پاڕانەوە دەچنە زیارەتی بۆ نموونە لە هەولێر خەڵکی دەچنە سەر گۆڕی بابە گوڕ گوڕ بۆ داواکردنی منداڵ یان دەچنە سەر شوێنی (عوزێر پێغەمبەر) کە لە حەوشەکەیدا بەردێکی گەورەو ڕەنگ کراو هەیە بەڕەنگی کەسك، و ئافرەتان بۆ ئەوەی پشت ئێشەیان چاك ببێتەوە پشت بەو بەردەوە دەدەن، ئیمام (سەقزیش) هەر لە هەولێرە کە دەکەوێتە تەنیشت یانەی سککەوەو ژنان دەچنە سەر ئەم گۆڕەش بەچوار شەموان و بنیشتیش لەگەڵ خۆیاندا دەبەن و بەکێلەکەوەی دەنووسێنن خەڵکی تریش ئەم بنێشتە لێ دەکاتەوە بۆ ئەوەی مرازی حاصل بێت، هەروەها ئەگەر منداڵێك پێ نەگرێت دەیبەنە سەر ئەم گۆڕەو بەدەوریدا دەیسوڕێنەوە تاکو منداڵەکە پێ بگرێ، گۆڕی (پنجەعلی)یش لەو گۆڕانەیە کە پیرۆزەو گوایە لەسەر ئەم گۆڕە بەردێك هەیە شوێن دەستی ئیمام (علی) بەسەرەوەیەو هەروەها دەڵێن ئەم گۆڕە لەکاتی باران و لافاودا بۆ خۆ ڕزگارکردن لە ئاوی باران هەڵدەکشێ بەرەو دواوە جا لەبەر ئەوە خەڵکی بە پیرۆزی دەزانێ و دەچنە زیارەتی جگە لەوەش پیاو چاکی تریش زۆرە کە خەڵکی هەولێر دەچنە سەری و هەر یەکێك لەوانەش حیکایەتی تایبەتی خۆیی هەیە[١٠٨].

لە تەواوی کوردستانیش گۆڕی ئەو پیاو چاکانە بڵاوبۆتەوە بۆ نموونە لە کەرکووك چەندین گۆڕی پیاوچاکان هەیە، لەوانە گۆڕی ئیمام (دەرماناو) کە گۆڕێکە لە سەر شاخێکە و ئەشکەوتێکی لێیە خەڵکی بۆ مەبەستی چاك بوونەوە دەچنە سەری و لە ئاوی کانیەکەیدا ئاو دەخۆن و خۆیان دەشۆن گوایە هی ئیمام دەرماناوەو شفایە، هەروەها بە مەبەستی مراز حاصل بوون دەچنە سەر گۆڕی (وەکاشە) کە کۆمەڵە بەردێکە گوایە ئیمام بووەو بەعسی روخاندوویەتی جا ئەو

(١٠٨ ) نامیلکەی هەولێر، ل١٥٢-١٦٢.



خەڵکانەی نەخۆش بن دەچنە سەری بۆ چاك بوونەوە و بەردی سەر گۆڕەکە هەڵدەگرن و بە خۆیانا دەیساون باوەڕیان وایە کە ئەو بەردە شیفای تیایە چونکە بەردی سەر گۆڕی وەکاشەیە، هەروەها لای گۆڕەکە دارێك هەیەو هەر کەسێك مرازێکی هەبێ دەسەسڕێك یان هەر شتێکی تر هەڵدەدا بۆ ناو دارەکە جا ئەگەر لەدارەکە گیربێت ئەوە مرازەکەیان حاصل دەبێت و ئەگەر دەسەسڕەکەیان بکەوێتە خوارەوە ئەوە مرازەکەیان حاصل نابێت، هەروەها ئیمام (ئۆمەرمەندان)یش هەبووە کە ئەو گۆڕەش لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ڕوخێنراوە جاران ئەوانەی شێت بوونە یان نەخۆشی دەروونیان هەبووە بردوویانەتە سەری بەمەسەتی چاکبوونەوە هەروەها هەر لە کەرکووك گۆڕی شێخ محی الدین هەیە کە زۆر جار لەسەر گۆڕەکە بەردی سپی و ڕەش بە مەبەستی پیرۆزی ڕیزکراوەو لەسەر گۆڕی (ئیمام قاسم)یش خەڵکەکە بەرد هەڵدەگرن و بەگۆڕەکەدا دەیخشێنن یاخود دەستیان بە گۆڕەکەدا دەخشێنن جا ئەگەر دەستیان تەڕبوو یان گۆڕەکەشی پەیا کرد ئەوە مانای وایە مرازیان حاصل دەبێ و ئەگەر دەستیان تەڕنەبوو ئەوە مرازەکەیان حاصل نابێ و ئەوانەی دەچنە سەر گۆڕی ئەو پیاوچاکانە لەگەڵ خۆیان پارچە پەڕۆیی سەوز دێنن وەك متفەڕك، جگە لەو گۆڕانەش کە باس کرا گۆڕی تر زۆرە کە پیاوچاکی پێ دەڵێن بۆ نموونە لە سلێمانی بە زۆری دەچنە سەر گۆڕی شێخ مارفی نۆدێ و... هتد. بە هەمان ئەو مەبەستانەی کە باس کراوە، وەکو باسیشمان کرد پیاو چاکی تر زۆرە لە کوردستان کە خەڵکی بۆ خۆیان کردوویانە بە مەزارو زیارەتی دەکەن لە دهۆك لە زاخۆو لە زۆر شوێنی تر جا ئەگەر بمانەوێ باسی هەموو ئەو گۆڕانە بکەین ئەوە باسێکی تایبەتی دەوێ، بەڵام ئەوەی گرنگە بەلای ئێمەوە ئەم گۆڕانە لەلای خەڵکی بە پیرۆز دادەنرێ و هەموو شتێکیش کە پەیوەندی بەم گۆڕانەوە هەبێ پیرۆزە تەنانەت بەردی سەر مەزارەکانیش و هەر یەکێك لەو قەبرانە کۆمەڵێك حیکایەتی تایبەتی هەیە دەکرێ هەمووی خورافات بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی بەستەزمان و فەقیر زۆرە تا باوەڕی پێ بکات و خوێندەواری ناڕۆشنبیریش زۆرە کە بەدوای دوعا و زیارەت و شتی وا کەوتوون خۆ ئێمە نکۆڵیمان لەوە نییە کە خەڵکی ڕێز لەگۆڕو مەزارەکانی خۆیان بگرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر سەیرە کاتێ خەڵکێکی زۆر دەبینین باوەڕێکی وا بەهێزیان بە دوعاکردن و زیارەتی پیاوچاکان هەیە بۆ مراز حاصل بوون، ئەگەرچی ئاینیش نکۆڵی لەم دیاردەیە کردووە، جا ئێستا لەزۆر شوێن زیارەتی ئەو پیاوچاکانە وەکو نەریتێکی لێهاتووەو بەیەکێك لەداب و نەریتەکانی گۆڕستان دەژمێردرێ، و جگە لە

پیاوچاکانیش گۆڕی عاشقە بەناو بانگەکانیش زیارەت دەکرێ لەلایەن خەڵکەوە وەکو گۆڕی (قەرو گوڵەزەر)و... هتد. و زۆر جار ئەمەش هەر بەمەبەستی مراز حاصل بوونە.

## لاواندنەوە:

(لاوانەوە هونەرێکە لاوێنەر یان شاعیر لەهەست و سۆزی خۆشەویستییەوە بەرامبەر بە مردووەکە دەری ئەبڕێ و بۆ مردووەکە دەگری و هەموو خاسیەتە جوانەکانی دەژمێرێ. ژیان و مردنی مردووەکە وێنە ڕێژ دەکات)[١٠٩].

دیارە مردن ئەو کۆسپە گەورەیەیە کە جەرگ و دڵی مرۆڤ دەهەژێنێ و دابڕانێکی هەمیشەییە لە ئازیزان جا لەبە ئەوە زۆرجار ئەو کۆسپە بۆتە هۆی وروژاندنی هەست و نەستی مرۆڤەکان و ئەمەش ڕەنگیداوەتەوە لەو شیعرو لاوانەوانەی کە بۆ مردوو دەکرێ، ئێمە دەزانین کە لاوانەوە سەرەتا لە تازییەوە یاخود لەمردنەوە دەستی پێ کردووەو زیاتریش ئافرەت دەستی باڵایان تێدا هەبوو. گوایە ئافرەت بە سۆز ترە، بەڵام جگە لەو لاوانەوەیەی کە لەتازیەدا بۆ مردوو دەکرێ زۆرجاریش شاعیران بە هۆنراوە بۆ مردووەکانی خۆیان دەلاوێننەوە و هەست و سۆزی خۆیان لە چوارچێوەی شیعرێکدا بەرجەستە دەکەن و نموونەی ئەم جۆرە شیعرانەش زۆرەو زۆربەی شاعیرەکانیش لاوانەوەیان هەیە بۆ کەسە ئازیزەکانیان، ئەمەش تەنها لە نێو شاعیرانی کورددا باو نییە بەڵکو لە زۆر شوێنی تریشدا باوە، بۆ نموونە لەلای شاعیرانی جاهلی عەرب نموونەی شیعری لاوانەوە هەیە یەکێك لەوانە (خنساء)ە کە بۆ براکەی شیعری لاوانەوەی وتووە لە بەیتێکدا دەڵێ:

وما لي لا ابكي على من لوانه     تقدم يومي قبله لبكى ليا

هەروەها (ابو سمال الاسدى) دەڵێ:

يعيرني الاقوام بالصبر بعده     وليس لصدع في فؤادي شاعب[١١٠].

لە نێو شاعیرانی کوردیشدا شاعیرمان زۆرە کە شیعری لاوانەوەی هەیەو باشترین نموونەی سەدەی هەڤدەهەم (مەم و زینی) ئەحمەدی خانییە، جگە لەویش (مەولەوی) چەندین شیعری لاواندنەوەی نووسیوە بۆ (عنبەر) خاتوونی خێزانی و لە یەکێکیاندا دەڵێ:

(١٠٩ ) ڕێ و ڕەسمی لاوانەوەی کوردی، ل١٦.

(١١٠ ) الحياة والموت في الشعر الجاهلي، ص١٥٥.



ئەی ڕۆشنیی چەم، تاکەی تەشریف بەر
لێڵاوی، سادەی! هوو ناوەی هوون کەر
پەی چێش؟ قیبلەکەم عەزم سەفەر کەرد
سێڵاو دووریش ڕیشەی هەستیم بەرد...[١١١].

هەروەها (مرثیە)ی تری هەیە بۆ شێخ (عبدالرحمن)ی تاڵەبانی و بۆ زۆری تر لەهاوڕێی و دۆستەکانی، جگە لە (مەولەوی)یش زۆری تر شیعریان بۆ مردووەکانی خۆیان نووسیوە کە (پیرەمێرد)یش یەکێکە لەوانە کە شیوەنی (نەو نەمامێکی) نووسیوەو بۆ کۆچی دوایی خوشکێکی (ئەحمەد بەگەی تەوفیق بەگ) شیعرێکی نووسیوەو بۆ زۆری تریش و (پیرەمێرد) لە هەڵبەستێکدا کە کۆتایی بە چیرۆکی مەم و زین دێنێ و لە (ئەحمەدی خانی)یەوە وەریگرتووە کە لاوانەوەی تیادایە دەڵێ:

هەی ڕۆ ئەمرۆ ڕۆیی شین و ڕۆ ڕۆمە
کە مەم ڕۆیی ڕوی پەژارەی خۆمە
ئەم زوڵفە لوولەم بۆ مەم شانە کرد
دەك فەلەك کوێر بێ بونێکی نەکرد...[١١٢].

جگە لەوانەی باسکران شاعیرانی تر زۆرن کە شیعریان بۆ مردوو نووسیوە یاخود لاوانەوەیان هەیە بۆ مردوو لەوانە شێخ نوری شێخ صالح، دڵدار، ئەحمەد هەردی... هتد.

جا شایەنی باسە زۆر لەو شیعرانەی کە لەسەر گۆڕەکان ئەمڕۆ دەنووسرێ ئەگەر موازەنەیان بکەین لەگەڵ شیعری ئەو شاعیرانەدا دەبینین زۆرجار لەیەکەوە نزیکن و هەندێ جار هەر بەیتی شاعیرەکان خۆیانە لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە، جار وایە هەندێك دەستکاریشی کراوە و ئەگەر هەر پێکچوونێك هەبێ لە نێوان ئەو شیعرانەی لەسەر گۆڕەکان نووسراون و ئەو لاوانەوانەی شاعیرەکان نووسیویانە ئەوە شتێکی ئاساییە هەتا ئەگەر لاوانەوەکانیش بەیەك بچن چونکە ئەوانە هەمووی لەیەك بابەتی سەرەکیدا یەك دەگرنەوە ئەویش مردن و لاوانەوەیە جا لەبەر ئەوە دەکرێ پێکچوون هەبێ لە شێوازی دەربڕینی ئەو هەست و سۆزانەدا. هەر لەو شاعیرانەش

(١١١ ) دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عبدالکریم مدرس، چ١، بڵاوکراوەی کوردستان، ایران، ١٣٧٨ هەتاوی، ل٤١.

(١١٢ ) پیرەمێردی نەمر، ل٢٠٠.

که لاوانەوەیان هەیە (هێمن)ی شاعیرە کە بەتایبەتی شیعرێکی هەیەو ناوی لێ ناوە (شینی ژنە کوردێك) و سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

هەی داد هەی بێداد هەی ڕۆ ڕۆڵە ڕۆ
هەی ڕۆڵە داخی گرانم بۆ تۆ
هەی کوێنم دەربەدەر ڕۆڵەی جوانم
وەی قوڕم وەسەرمایەی ژیانم
دایکەکەت بمرێ ڕۆڵەی نازدارم
دەك نەژیم پاش تۆ شۆڕە سوارم... هتد[113].

جا ئەو شیعرە دوور و درێژە، بەلاّم هەر وەك وتمان زۆر لەولاوانەوانە بە یەك دەچن و ئەگەر بێت و بچینە ناو تازیەو گوێ لەلاوانەوەی دایکان بگریین ئەوە بە ئاسانی هەست بە پێکچوونی نێوان دەستەواژەو دەربڕینەکان دەکەین لە نێوان ئەو شیعر و لاوانەوانەدا، دیارە باسی ئەوەشمان کرد کە ناوەڕۆکی ئەم بابەتە (شین و لاوانەوە) لە خالێکی سەرەکیدا یەك دەگرێتەوە ئەویش مردنە جا لەبەر ئەوە لەلاوانەوەدا هێڵی سەرەکی باسەکە مردنەکەیەو لەوێوە دەست پێ دەکەن و پاشان لە نواخنەکەی دا دەگەڕێنەوە سەر سیفات و خوڕەوشتی مردووەکەو باسی دۆخی مردنەکە دەکەن و لاوانەوەش بەپێی ئەو ڕەگەزەی بۆی دەلاوێنەوەو بەپێی پایەی کۆمەلاّیەتی و تەمەنی مردووەکەو دۆخی مردنەکە دەگۆڕی واتە لە شێوازی داڕشتەنەکەیدا جیاوازی دەبێ.

ئەگەر بمانەوێ زیاتر ئاشناییمان هەبێ لەگەڵ ئەو لاوانەوەی کە لە نێو تازیەکاندا دەکرێ پێویست دەکات لەنزیکەوە گوێی بۆ بگریین، بەلاّم بۆ ئەم مەبەستە ئێمە ڕێگەکەمان کورت کردەوەو لە کتێبی (ڕێ و ڕەسمی شین و لاوانەوەی کوردی)، (د. شوکریە رەسول)دا تەواوی زانیاریەکانمان وەرگرت چونکە لەوێ بە وردی باسی لاوانەوە کراوە.

جا ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە لەلاوانەوەو شینی کوردیدا چەند خالێکی گرنگ هەیە کە دەبێ بیزانین ئەویش:

(١١٣) دیوانی هێمن موکریانی، بە سەرپەرشتی سەیران حیکمەت و سەردار شەمزاو بلاّوکراوەی عیراق- کوردستانی ئازاد، کوردستان، ٢٠٠٥، ل٣٧٢.



١. بەیتی لاوانەوە بریتییە ل (دوو- سێ- چوار- پێنج- شەش) بەیت. قافیەی بەیتەکان/ ئا ئا ئا/ ئا ئا/ ب ب.
٢. ئەم بەیتی لاوانەوەیە نەگۆڕن.
٣. لە کرمانجی ژووروودا سەربەیتەکان دووبارە نابنەوە.
٤. بەلاّم لەکرمانجی خواروودا سەرە بەیتەکان دووبارە دەبنەوە.
٥. لاوانەوەی کوردی کورت برییە بە بەرزترین دەربڕینی هەست دەژمێردرێ کە زیاتر کار لە گوێگر دەکات.
٦. زمانی لاوانەوە پڕە لەخوازە (سیارێ ئەسپی دیل بەردان)، (چاوم دەگێڕم سەرداری ماڵ نابینم) (ڕۆڵە خێر لەخۆنە دیوەکەم).
٧. شینی کوردی لە کرمانجی ژووردا بەمە دەست پێ دەکات. (لۆ- لۆ- سیارۆ) (هەی- لۆ- سیارۆ) (لۆ باڤۆ- هەی- لۆ برایۆ) و ژنان ئەلێن: لێ- دایێ، لێ دایێ (لێ ڤایێ- لێ ڤایێ).
٨. لە شینی کوردیدا کێشی پەنجە زۆر بەرچاو دەکەون، زۆرجار بڕگەکان (١٠-٢٥) بڕگە دەبێ، زۆرجاریش قافیەکان یەکن وەکو: دە بڕگەیی:

هە شەڕە شەڕە شەڕ لە قەراجێ
دەنگی تۆپان دەێ لەچیای باواجی
برینی ئەو لاوە نەکرا عیلاجی[114].

بە گشتی ئەو خالاّنەی سەرەوە هەندێ تایبەتی گرنگن لەمەڕ شێوازی لاوانەوەی کوردی بۆیە باشمان زانی لێرەدا باسی بکەین جگە لەوەش کۆمەلێك وردە کاری تر هەیە کە دەکرێ بایەخی پێ بدرێ بۆ نموونە ئەو لاوانەوانەی کە هەیە پۆلین بکرێت بەپێی ئەو ڕەگەزەی لاوانەوەکەی بۆ وتراوە یان بەپێی دۆخی مردنەکان و.. هتد. بەلاّم ئێمە لێرەدا ناچینە ناو وردەکاری ناواخنی ئەم بابەتەوە چونکە ئێمە بە شێوەیەکی سەرانسەری و کورت بڕ باس لەلاوانەوە دەکەین لەبەر ئەوە تەنها باسی هێڵە سەرەکییەکانی لاوانەوە دەکەین.

شایەنی باسە لەلاوانەوەدا ئەو کەرەسەیەی کە لەبەر دەستی لاوێنەرەو شێوازی داڕشتنی لاوانەوەکەی پێ دروست دەکا بریتییە لە سیفات و ڕەگەز و تەمەن و دۆخی مردنی کەسە

(١١٤) ڕێ و ڕەسمی شین و لاوانەوەی کوردی، ل١٧-١٨.

مردووەکە، ئایە منداڵە، گەنجە، پیرە، بە نەخۆشی مردووەیان شەهیدە یا..هتد. جا ئەو زانیاریانە بەشدار دەبن لە دارشتنی لاوانەوەکەدا جگە لەوەش شێوازی لاوانەکە دەگۆڕی بەپێ کەسی لاوێنەر ئایە کەسەکە کاری لاوانەوەیە یان دایکە بۆ منداڵەکەی دەلاوێنتەوە یا خوشکە بۆ براکەی، بەڵام بەگشتی لە لاوانەوەدا هەندێ شت هەیە کە نەگۆڕە ئەویش شێوازە گشتییەکەی لاوانەوەیە بۆ نموونە زۆربەی لاوانەکان بەهەی ڕۆ... هەی ڕۆ دەست پێ دەکات ئەو نموونانەی خوارەوەش هەندێك لەو نموونە گشتیانەی لاوانەوەیە کە لەشینی نێو تازییەکاندا دەیبیستین:

– زۆرجار لەشینی باوەکدا بەم جۆرە دەست پێ دەکەن:

هەی ڕۆ... باوکی داماوم ڕۆ
هەی ڕۆ بابە ڕۆ... ئازیزم ڕۆ هەموو کەسم ڕۆ... هتد.

– بۆ منالیش دەڵێن... ڕۆڵە ڕۆ... بەچکەم ڕۆ
ڕۆڵەی داماوم هێز و هەناوم
کۆچت لەناکاو بوو کوێربێ دووچاوم

– و لەشینی خوشکیشدا بۆ برای:
برای بەد بەختم هیچ خۆشیت نەدیت
قەبری تەنگ و تار زووکردت بەجێت
یانیش/ برا ڕۆ... برا ڕۆ... برا ڕۆیی چی بەجێ ماوە
لە تازییەو شین و گری بەولاوە
لەشینی شەهیدا: هەموو عالەم شاد هەر من ناشادم
کۆچ باری کۆچی شەهیدی وڵاتم
یان / هەی ڕۆ... کەسی کەسانم ڕۆ
شەرکەری شەڕم ڕۆ
پێشمەرگەی شەهیدم ڕۆ(*).

(*) لە نموونەی ئەو لاوانەوانەی سەرەوە زۆرەو زۆر جاریش تێکستی ئەو لاوانەوانە لەسەر گۆڕەکان دەنووسرێ و لە وێ دەست دەکەوێ.



ئەگەرچی زۆرجاریش دەبینین بۆ شەهید دەنووسرێ یان دەڵێن شەهیدە شین و ڕۆ ڕۆی پێ ناوێ، بەهەر حاڵ نموونەی تر لەناو فۆڵکلۆردا زۆرەو هەر کەسێك بیەوێ دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ دەقەکانی لاوانەوە بەتایبەتی لە کتێبی (ڕێ و ڕەسمی لاوانەوەی کوردی)دا.

ئەوەی کە باسکرا تەنها هەوڵێك بوو بۆ پیشاندانی سروشتی نەریتی لاوانەوە کەیەکێکە لەو نەریتانەی کە لەتازیەدا پەیڕەو دەکرێ و پەیوەندی بە دیاردەی مردنەوە هەیە، و بەم شێوەیەش مرۆڤ هەوڵی داوە هیچ نەهێڵێتەوە لەدڵی خۆیی و هەمیشە پەنجەرەیەك دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی هەستەکانی خۆی لەڕێیەوە دەربڕێت.

بەکۆتایی هێنان بە لاوانەوە کۆتای بەهەموو جیهانی گۆڕو گۆڕستان و مردوو دێنین، بەڵام ژیان کۆتایی نەهاتووە و هەتا ژیانیش بەردەوام بێ شتەکانیش هەمیشە لە گۆڕاندا دەبێ جا خوا دەزانی لە داهاتوودا داب و نەریتەکانیش کەش و هەوای ژیان چی بەسەر دێنێ و چۆنی دەگۆڕێنێ.



(وێنه- ٥٦) گۆڕستانی (شێخ محی الدین) ی کەرکووك لەدوورەوە



(وێنه-٥٧) وێنەیەکی گشتی بۆ گۆڕستانی شێخ محی الدین/ کەرکووك





(وێنه-٥٨) وێنەیەکی گشتی بۆ گۆڕستانی شێخ محی الدین-
کەرکووك



(وێنه-٥٩) شاعیری کورد (ئەسیری)
گۆڕستانی شێخ محی الدین- کەرکووك



(وێنه-٦٠) هونەرمەندی شاری کەرکووك (عەلی مەردان)

گۆڕستانی شێخ محی الدین



(وێنه-٦١)

(وێنه -٦١) وێنەیەکی گشتی بۆ گۆڕستانێکی کۆنی ناو بازاڕی شاری دهۆك.





(وێنه-٦٢) گۆڕی سەیدێك لەسەر شۆستەیە لەتەنیشت گۆڕستانێکی کۆنی ناو بازاڕی شاری دهۆك



(وێنه-٦٣)

(وێنه-٦٣) دیمەنێکی گشتی بۆ گۆڕستانی شاخکی- دهۆك



(وێنە-٦٤) دیمەنێکی گشتی گۆڕستانی شاخکی- دهۆك



(وێنە- ٦٥) گۆڕی هونەرمەند (محمد عارف جزیری)

گۆڕستانی- شاخکی دهۆك






(وێنە- ٦٦)

(وێنە-٦٦) گۆڕێکی گۆڕستانی شاخکی/ دهۆك

کە نووسینەکەی سەری بەپیتی لاتینییە



(وێنە-٦٧) دیمەنێکی گشتی گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنە-٦٨) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنە-٦٩) دیمەنێکی گشتی گۆڕستانی چراغ- هەولێر





(وێنە-٧٠) گۆڕی شاعیری کورد (کانی) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنە-٧١) شاعیر و مفسری کورد

(مەلا حسین شێخ سعدی) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنه-٧٢) شاعیری نیشتمان

(شێخ جلال شێخ جمیل نەقشەبەندی (نوری)) گۆڕستانی چراغ- هەولێر



(وێنه-٧٣) دیمەنێکی گشتی گۆڕستانی سەیوان/ سلێمانی





(وێنه-٧٤) دیمەنێکی گشتی گۆڕستانی سەیوان/ سلێمانی



(وێنه-٧٥) گۆڕی دوو شاعیری بڵندو پایە بەرز  گۆڕی دەستە ڕاست شاعیری کورد (کوردی)یە گۆڕی دەستە چەپ شاعیری کورد (سالم)ە گۆڕستانی سەیوان/ سلێمانی




(وێنە-٧٦) گۆڕی شۆڕشگێڕ (مستەفا پاشای یا ملکی)

گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی




(وێنە-٧٧) گۆڕی شاعیری نەتەوەی کورد (محمد صالح دیلان)

گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی






(وێنە-٧٨) گۆڕی هونەرمەندی گەورە (رەفیق چالاك)

گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی




(وێنە-٧٩) گۆڕی مێژوونووس (محمد امین زەکی بەگ)

گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی




(وێنە-٨٠) گۆڕی (شێخ محمدی خاڵ)ە گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی




(وێنە- ٨١)

(وێنە-٨١) گۆڕی شاعیری کورد (کاکەی فەلاح)

گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی





(وێنە-٨٢) گۆڕی (فایەق بێ کەس )

گۆڕستانی سەیوان- سلێمانی



(وێنە- ٨٣)

(وێنە-٨٣) دیمەنێکی گشتی گۆڕستانی شەهیدان/ سلێمانی



(وێنە-٨٤) گۆڕی (حفصەخانی نەقیب)
گۆڕستانی شەهیدان/ سلێمانی



(وێنە- ٨٥) گۆڕی هونەرمەندی گۆرانیبێژ
(مەرزیە فەریقی) گۆڕستانی شەهیدان/ سلێمانی






(وێنە-٨٦) گۆڕی شاعیری گەورە (گۆران)
گۆڕستانی گردی ناوەڕاست/ سلێمانی




(وێنە-٨٧) گۆڕی ڕۆژنامەنووس (دیلمان عثمان)




(وێنە-٨٨) گۆڕی هونەرمەندی شاری سلێمانی (ئیبراهیم خەیات)
گۆڕستانی گردی ناوەڕاست/ سلێمانی

## مردن لای مەسیحییەکان:

کوردستان نیشتمانێکی گەورەیەو میللەتەکەشی لەلایەن ئایینەوە فـرە ئـاینن، موسـڵمان، مەسیحی، زەردەشتی، یەزیدی، کاکەیی... هتد. و تەنانەت پێشان جوولەکەشی لێ بووە.

دیارە هەر ئاینێك کۆمەڵێ داب و نەریت و باوەڕی تایبەتی هەیە بۆ خۆی، جـا ئێمـە لـەم بەشەدا هەوڵدەدەین باسی مەسیحییەکان بکـەین و بەتایبـەتیش لەمـەڕ هەڵـسوکەوتی ئـەوان لەگەڵ دیاردەی مردن و شێوازی گۆڕو گۆڕستانیان.

مەسیحییەت ئایینێکی ئاسمانییەو کتێبی ئاینیان (ئنجیل)ە، ئەوانیش لەناو خـۆدا دەبنـە چەند بەشێکەوە، بەگشتی لەمەڕ دیاردەی مردنەوە پێیان وایە کـە لـەش فانییـەو مانـەوە بـۆ ڕوحەو هەموو مەسیحییەك باوەڕی بەزیندووبوونـەوەی حـەزرەتی (عیـسا) هەیـە لـەدوا ڕۆژی جیهاندا.

ئێمە بۆ مەبەستی زیاتر ئاشنا بوون بە بـاوەڕو داب و نـەریتی مەسـیحییەکان چـوینە لای قەسی کلێسەیەك بەناوی (القس صطیفیان ربان) قەسی کلێسەی کلدانی (مار یوسف) لەشـاری کـەرکووك و ئـەو لـەبارەی داب و نـەریت و بـیرو بـاوەڕی خۆیانـەوە چـەند شـتێکی بـۆ ڕوون کردینەوە.

سەرەتا لە باسکردنی مەسەلەی روحدا وتـی (روح لـەلای ئێمـە لـەپاش مـردن ڕاسـتەوخۆ دەچێتە دادگایی (رب) خودا جا ئەگەر روحێکی زۆر پاك بێت و هـیچ خراپـەی نـەکردبێ ئـەوە دەچێتە جەنەتەوە، جەنەتیش لای ئێمە ئەوەیە روحەکە بچێتە دیداری (رب) و دەم و چاوی خوا ببینێ، و ئەگەر روحەکە خراپەکار بووبێ و سەد لەسەد هەر خراپەی کردبێ ئەوە دەچێتە جهـنم و لەوێ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە، و ئەگەر روحەکە باشەو خراپەی وەکوو یەك بێ ئەو دەچـێتە (المطهر) کە جێگایەکی کاتیە دەبێ لەوێ روحەکە چی خراپـەی لەسـەرە پاداشـتەکەی بداتـەوە هەتاکوو پاك دەبێتەوە پاشان لەوێوە دەردەچێ بۆ جەننەت) واتە لەلای ئەوان دادگـایی کردنـی روحی مرۆڤ هەر لەیەکەم ساتی مردن دا دەبێت ونامێنێتەوە بۆ ڕۆژی قیامەت و لـەبارەی ئـەو ڕۆژەی کە مردوەکان تیایدا هەلدەستنەوە لە ئینجیلی. (مرقس) دا نەسـێیك لـە سـەر زمـانی (یسوع) دا هاتوە (فعندما یقوم الناس مـن بـین الامـوات لایتزوجـون ولا یزوجـون بـل یکونـون



کالملائکة الذین فی السموات)[١١٥]. واتە روانینی ئەوان بۆ قیامەت بە شێوەیەکی تـرە .پاشـان هاتینە سەرباسی داب و نەریتی مەسیحیەکان لە هەلسوکەوت کردن لەگەل دیـاردەی مـردن و لەو بارەوە قەسەکە بۆمان دواو ووتی (ئێمە پێشان کە مردوویەکمان لێ دەمرد دەمـان شوشـت بەلام ئێستا ئەم نەریتە نەماوە و تەنها (ئاشوریەکان ) ئەوان مردوو دەشۆن و ئـەم نەریتەشـیان لە جولەکەوە وەرگرتوە .کەچی ئێمە نایشۆن ,بەلاّم مردوەکان دەبەینە کەنیسەو زەنگی کەنیسە لێ دەدەین واتا شتێك رووی داوە و لەکەنیسەدا ژن وپیـاو نوێـژ لەسـەر مردووەکـە دەکـەین و جوانترین جل وبەرگی دەکەینە بەری وبۆنی خۆشی پیادەکەین ودەیکەینە ناو تابوتەوە ,هەندێك خانەوادە هەیە پـارەدارن لەبـەر ئـەوە تـابوتی بـاش دروسـت دەکـەن لـە داری ( صـاج) بـۆ مردووکەیان, بەلاّم ئێمە لە کەنیسەکەی خۆماندا مردووەکان دەکەینە نێو یەك جۆرە تابووتەوە کە لەیەك جۆردار دروست کراوە، چونکە ئێمە باوەڕمان بەوەیە کە خەڵکی هەموو یەکسانن لـە پلەو پایەدا لەسەر زەوی، بەلاّم ئەوەی حەزی لێ بێ خۆی بۆ مردووەکە تـابووتی تایبـەتی دەدا بەکردن. پاشان مردووەکە دەبەینە گۆڕستان لەوێ پێشتر چـاڵی ناشـتنی بـۆ حـازر کـراوە کـە چاڵێکە بە قولاّیی ١,٥م یان زیاتر ئەوەش بۆ ئەوەی بۆنی لاشەکە نەیە پاشان بـە تابووتەکـەوە مردووەکە دەخەینە ناو چاڵ و گوڵ و بخورو شـتی واش دەبـەین لەگـەڵ خۆمانـدا جـا قەسـەکە هەندێك خۆڵ هەڵدەگرێ و دەڵێ (انك من التراب والی التراب تعـود) واتـە: تۆلـە خـۆڵی و بـۆ خۆڵیش دەگەڕێتەوە جا پاشان نوێژێکی تایبەتی لەسەردەکەن و گۆڕەکەی بە خۆڵ پڕ دەکەنەوەو پاشان بە قاڵبی چەمنتۆ کە حازر کراوە لەوە پێش بانی قەبرەکە دەدەین، هەروەها ئێمە ناهێڵین ئافرەتان بێنە قەبرستان و بەشداری ناشتنەکە بکەن، بەلاّم لەهەندێ شـوێندا ئـافرەتیش دەڕوا. مردووی مەسیحیش بەرەو ڕۆژهەلاّت دەنێژرێ واتە سەری مردووەکە بەرەو ڕۆژهەلاّتـە چـونکە ئێمە لەو باوەڕەین کە حەزرەتی مەسیح لەڕۆژهەلاّتەوە دێتەوە)، سەبارەت بەزیارەتی قەبریش لە سێیەم ڕۆژی مردنەکەدا و لە چلەو لە سالاّنەدا بەتایبەتی ئافرەتان دەچنە سەر قەبران هـەروەها لە موناسەبات و جەژنەکانیشدا کەسوکارەکان دەچنە زیـارەتی گـۆڕی مردووەکانیـان و گـوڵ و بوخور دەبەن و مۆم دادەگیرسێنن، مەبەستیش لەم مۆم داگیرساندنە ئەوەیە کـە ڕوونـاکی ئـەم مۆمە ڕووناکی حەزرەتی مەسیح بەسەر مردووەکەدا دێنی هەروەها لەبەر ئەوەی ڕووناکی دژی تاریکییەوە کە ڕووناکی هەڵ بێت تاریکی ڕاوەدەنێت).

---

( 115) کتاب الحیاة(العهد الجدید ) /عربی –ئینگلیزی –الطبعة الرابعة، س١٩٩٢، ص١٤٤.

دیارە لەلای مەسیحییەکانیش کۆمەڵێك شت هەیە لەڕابردووەوە هەتا ئێستا گۆڕانی بەسەردا هاتووە لە نێو ئەو نەریتانەی کە پەیوەندی بەمردنەوە هەبوو، بۆ نموونە لەناو ئنجیلی (مرقس) دا کە باس ناشتنی حەزرەتی (عیسا) دەکات دەڵێ کە (یوسف)ی (رامە) لاشەکەی حەزرەتی (عیسا) وەردەگرێتەوە (اذا اشتری یوسف کتانا وانزل الجثمان ولفه بالکتان، ودفنة في قبر کان قد نحت في الصخر ثم دحرج حجراً علی باب القبر...)[116].

واتە: پێشان کفنی مردووەکەیان بە (کەتان) کردووە، بەڵام ئێستا مەسیحییەکان بەر لە کفنکردنی لاشەی مردووەکە جوانترین جلی دەکەنە بەر پاشان بە هەر چ قوماشێکی سپی بێ کفنی دەکەن ئینجا دەیکەنە ناو تابووتەوەو هەندێ جاریش قەشەکە لە بڕی شووشتنی لاشەکە هەموو لەشی مردووەکە بەرۆنێك چەور دەکا بەناوی (رۆنی میرۆن) و زۆرجاریش ئەوەی لەسەر مەرگرایە خۆی داوا دەکات قەس بێت و چەوری کا بەو ڕۆنەو نوێژی لەسەر بکا، دیارە لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی نەریتەکانی مردوو ناشتن و هەڵسوکەوتیش لەگەڵ دیاردەی مردندا هەندێك جیاوازی هەیە لە نێوان کەنیسەکان چونکە ئەوانیش چەند تیرەیەکن و کەنەیسەی کلدانی و ئاسوری و سریانی و ئنجیلی و ئارثودۆکس و کاثولیك... هتد. هەیەو ئەم کەنیسانەش لەڕێ و ڕەسمەکاندا جیاوازیان هەیە.

هەروەها مەسیحییەکان وەکو موسڵمانەکان چەندین مەزاریان هەیە کە بۆ دوعاو پاڕانەوەو مراز حاصڵ بوون دەچنە زیارەتی بۆ نموونە (دێری مارمەتی و ربان هرمز) لە موسڵ و (مەریم العذراء) لە بغداو چەندین شوێنی تر لە کوردستان لە ئامێدی و زاخۆ و شەقڵاوەو بەناوبانگترین شوێن لە شەقڵاوە مەزاری (وەسۆرەحمان)ە موسڵمان و مەسحیش دەچنە سەری لەیادو موناسەبە تایبەتییەکاندا. هەروەها لەمەڕ داب و نەریتی مردوو ناشتن، لەلای مەسیحییەکانی شەقڵاوە گوایە (کە یەکێك ئەمری خوای دەکرد خەڵکی گوندەکە کۆ دەبنەوەو پاش ئەوەی پێیان ڕادەگەیێنرا بە لێدانی زەنگ (الناقوس) هەندێ پیاو دەچوونە سەر قەبران بۆ ئامادەکردنی قەبر پاشتر جەنازەیان دەهێناو دەیان شاردەوەو قەشە هەندێك خۆڵی هەڵدەگرت بەسەر قەبرەکەی دا دەداو دەیگوت لەخۆڵ دروست کراوی بۆ خۆڵیش دەگەڕێتەوە و چەند نوێژێك لەسەر روحی مردووەکە دەکرێت (صلواتی الموتی) و پاشتر ئنجیل دەخوێنرێت و پێشان خزمی نزیکی مردووەکە دەهاتن و دەستی قەشەیان ماچ دەکرد، بەڵام ئێستا نەماوە، خزم و

( 116) کتاب الحیاة (العهد الجدید) ، ص١٦١.



کەسوکار هەموویان دەهاتنە ماڵی مردووەکە و نوێژی تایبەتیان دەکرد پێش دانیشتن و هەر یەکێك بهاتایە نوێژەکەی دووبارە دەکردەوەو تازییەکە حەوت ڕۆژی دەخایاند، بەڵام دواتر بوو بەسێ ڕۆژ و هەر کەسێك بهاتبوایە بۆنان خواردن (نیوە ڕۆیان عیشا) نانی لە ماڵی خۆی دەهێنا لەگەڵ خۆی و زۆر لە خزمانی شەو لەماڵی مردووەك دەمانەوەو پاش تازییەکە بانگهێشتی سەرتاش دەکرا بۆ ئەوەی سەری خزمەکانی مردووەکەو خەڵکی دیکە چا بکات، بەڵام ئێستا ئەو نەریتە نەماوە[117].

دیارە ئەگەر بمانەوێ باس بکەین وردەکاری تر زۆرە لەمەڕ داب و نەریتی مەسیحییەکانەوە سەبارەت بە دیاردەی مردن، بەڵام ئەوەی باسکرا تەنها تیشکێك بوو بە گشتی خستمانە سەریان.

## گۆڕستانی مەسیحییەکان:

گۆڕستانی مەسیحییەکان شێوازێکی تایبەتی هەیە، تایبەتێکەشی لە شوێن و شێوازی ناشتنەکەدایە، دیارە لە ڕابردوودا ناشتنی قەشەو ڕەبن و بەطریریك و پیاوە ئایینییەکان جیاوازی هەبووە لەگەڵ خەڵکە ئاساییەکە، چونکە شوێنی ناشتنی ئەو پیاوە ئایینیانە زۆرجار لە کڵێسەو دێرەکانیاندا بووە یاخود لە (مدفن) (گۆڕی تایبەتیدا بووە) بەهەر حاڵ ئەو شێوازانەی کە پەیڕەویان کردووە لە ناشتنی مردووەکانیاندا لە کۆنەوە هەتاکو ئێستا گۆڕاوە جا ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین باسی چەند نموونەیەك بکەین لە گۆڕە کۆنەکانی ئەوان و پاشان بچینە سەر باسی شێوازی گۆڕو گۆڕستانی ئەم سەردەمەیان.

مەسیحییەکان بە شێوەیەکی پەرتەوازە بەهەموو کوردستانی گەورەدا بڵاوبوون و لە کوردستانی عێراقدا زیاتر جێنیشینی شەقڵاوەو ئامێدی و زاخۆو موسڵن، بەڵام لە کوردستانی باکووریشدا لە چەندین شارو دێدا بڵاون و کڵێسە کۆنەکانیان هەتاکو ئێستا ئاسەواری ماوەتەوە.

( 117) مێژوو داب و نەریتی مەسیحییەکانی شەقڵاوە، ڕزگار شمعون تۆما، گ؛ ئاسۆی فۆلکۆر، ژ٣، هەولێر، ٢٠٠١.

سەبارەت بە ناشتنی مردوو وا دەردەکەوێ کە لەڕابردوودا گۆڕ لەناو حەوشەی کەنیسەو دێرەکان دابووە، بەڵام پاشان ئەوانیش شوێنێکی تایبەتیان بۆ مردوو ناشتن داناوە هەندێ جار ئەو شوێنە بەتەنیشت کڵێسەکانیانەوە بووە.

یەکێك لەو دێرە کۆنانەی کە گۆڕی تیادا بووە دێری (سیمون شتیلیت)ە کە دەکەوێتە نێو قەڵای (سمعان) لە (حەلەب) لە سووریا کە مێژوی دروست کردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پێنجەمی زاینی، جا هەر لەلای دەرگای دێرەکەوە بینایەکی بچووك دروست کراوە، ئەو بینایە بریتییە لە گۆڕستانێکی تایبەت بە (رەبەنەکان)ی دێرەکە. ئەم بینایە لەبەرد داتاشراوەو بە بەرد دروست کراوەو دەرگای تایبەتی هەیەو سێ پەنجەرەشی بۆ کراوە، ناوەوەی ئەم بینایەش وەکو هۆڵێکە شوێنی تایبەتی تیادایە بۆ مردوو ناشتن ئەو شوێنانە لەنێو چینی دیواری ژوورەکەیە لەهەر لا دیوارێك سێ شوێنی دیاری کراو هەیە بۆ ناشتنی مردووەکان و لە دیواری پشتەوە دوو شوێن دروست کراوە بۆ مردوو ناشتن و ئەم شوێنانەش تایبەتە بە ناشتنی ڕەبەنەکان[118].

هەروەها لە دێری (زەعفران) کە لە نزیك شاری (ماردین) ی کوردستانی باکوورە کەنیسەیەکی کۆن هەبووە لەدوو ژوور پێك هاتووە لە ژوورەکەی پێشەوە دوو شوێنی تایبەتی تیادایە بۆ ناشتنی سەرۆك قەشەکان، و لە ژوورەکە پشتەوەش سێ شوێنی تایبەتی تیادا بووە بۆ ناشتنی بەتریارکەکان، ئەو شوێنە تایبەتیانەش بریتی بوونە لە چاڵێك لە نێو چینی دیواری ژوورەکە، کە یەکێك لەو پیاوە ئایینیانە مردووە بەردی سەر ئەو چاڵەیان لاداوەو مردووەکەیان خستۆتە ناوی و لەسەر ئەو بەردەی کە بۆی حازرکراوە پاڵیان خستوەو ڕەمزیی روحیی ڕەبەنەکانیش کەداری شوانکارەیە دەخرا دەستی مردووەکەو لەگەڵی دەنێژرا[119]. دیارە ئەو دارەش بۆیە پیرۆزە لەلایان، چونکە حەزرەتی (عیسا) سەلامی خوای لەسەر بێ دارێکی شوانی بەدەستەوە بووەو معجزەیی پێ دروست کردووە، یاخود لەبەر ئەوەی نیشانەی (زهد)ی ئەوان بووە.

(118) المباني الاثرية في شمال بلاد الرافيدين في العصور المسيحية القديمة والاسلامية، كونراد بروسير، ت. د. علي يحيى منصور، المؤسسة العامة للاثارو التراث، بغداد، ١٩٨١، ص٦٥.

( 119) سەرچاوەی پێشوو، ص٧٣.



نموونەیەکی تر لەو دێرانەی کە گۆڕی تیادا بووە دێری (الرهبان هرمز- هرمزد) کە لە نزیك شاری (موسڵ)ە بەلای (تلکێف)وە، ئەم دێرە (دێری ربان هرمزد) دێری کلدانییەکانەو مێژووی دروست کردنی بو سەدەی سێزدەو چواردەی زاینی دەگەڕێتەوە[120]. لەم دێرەدا ژوورێکی تایبەتی تیادایە بۆ ناشتنی بەتریارکەکان و گۆڕی نۆ بەتریاك دەگرێتە خۆ، ئەو ژوورە شێوەیەکی لاکێشەیی یان چوار گۆشەیی هەیەو دەکەوێتە ئەو ڕێڕەوەی کە دەگاتەوە گۆڕی (ربان هرمزد)، هەروەها ئەو نۆ گۆڕە لەسەر هەر یەکیان کۆمەڵێك نووسین کراوە بەزمانی سریانی کە باس لەژیان و پلەو پایەی ئایینی ئەو بەتریاکانە دەکات[121]. و لەپاشاندا نەسی ئەو نووسینانە دەهێنینەوە بە نموونە.

سەبارەت بەدێری ربان (هرمزد) لە چەندین کتێبەوە زانیارمان لەبارەیەوە دەست کەوت، لە نامەی دکتۆرای مامۆستا (نەرمین علی محمد) مامۆستا لە کۆلێژی شوێنەوار لە زانکۆی سەلاحەدین بەوردی باس کراوە، جا لەبەر ئەوەی نامەکە بە فەرەنسییە (مامۆستا نەرمین) خۆی هەندێ شتی لەبارەی ربان (هرمزد)وە بۆ کردینەوە بەکوردی.

(لەدێری ربان هرمزد بەشێك هەیە پێی دەوترێ (مارتریۆم- martyriom) بيت الشهداء- ماڵی شەهیدەکان) کە بەشێکە لەکەنیسەکەو شێوەیەکی چوار گۆشەیی یان لاکێشەیی هەیەو لەناو ئەم بەشەداو لە دیوارەکانی تەنیشتی چاڵ بەشێوەیەکی لاکێشەی تەریب هەڵکۆڵراوەو هەر یەکێك لەو چاڵانە بە (پلاك)ێك واتە پارچەیەك وەك تابلۆ کە بە مەڕ مەڕ دروست کراوە بان دراوە، و ئەو پلاکانە بەزمانی سریانی لەسەری نووسراوە) ئێمە نەخشەی هێلکاری ئەم دێرەمان وەکو خۆی لە نامەکەی مامۆستا (نەرمین)وە وەگرت (هێلکاری-١) کە تیایدا شوێنی (بيت الشهداء) کە بەجوانی دیارە.

هەر لە بارەی ئەو دێرانەی کە گۆڕی تیادایە مامۆستا (نەرمین) لە نامەکەیدا باسی جۆرێکی تر دەکات کە (بيت الشهداء- مارتیریۆم)ەکەی جیایە لە کەنیسەکە واتە بەشێکی سەربەخۆیە ئەم نموونەیەش لەدێری خضر الياس- ماربهنام دا هەیەو شێوەیەکی دەگمەنە لە کوردستان، شوێنی مردوو ناشتنەکەی بینایەکە بە شێوەی هەشت لایەو دەوری (٦،٥)م

( 120) سەرچاوەی پێشوو، ص٣٧.

( 121) اثر قديم في العراق (دير الربان هرمزد)، گورگيس حنا عواد، مطبعة النجم، موصل، ١٩٤٣، ص٣٣.

لەدێرەکەوە دوورەو لەم شوێنەدا دەڵێن پاشماوەی مردووەکانی (ماربهنام)ی تیادایە وە دەرگای چوونە ژوورەوەی لەرێی دوو نەفەقەوەیەو تاکو زیاتریش ئاشنا بین بە شێواز و شوێنی گۆڕەکە لەناو دێرەکە، نەخشەی هێلکاری (ماربهنام) مان وەك خۆیی لەنامەی دکتۆرای مامۆستا (نەرمین)وە وەرگرت بڕوانە (هێلکاری-٢) کە تیادا شێوەی (ماتریۆم)ەکەی بەجوانی وێنە کراوە.

نموونەی ئەو کڵێسەو دێرانە زۆرە کە گۆڕی قەشەو رەبەنەکانی تیادایە جگە لەوەش چەندین گۆڕستانی بەردینی کۆنیشیان هەیە کە بۆ سەردەمی چاخەکانی مەسیحییەت دەگەڕێتەوەو یەکێك لەو نموونانە گۆڕستانێکی کۆنە.




(هێلکاری- ١) RABBAN HORMUZD[122] (ربان هرمزد)

A.eglise- کەنیسە
B. Narthex- ڕێڕەو
C. Caverne- ئەشکەوت
D. Vestibule- ڕێڕەو
C. annexe- پاشکۆ
F. caverne- ئەشکەوت
M. martyrion ماڵی شەهیدەکان
t. tombeau- گۆڕ

(122) Les e'glises et monaste'res du ((Kurdistan irakien)) a la veille et au lendemain de l'slam, The'se de doctorat presente'e par Madame Narmen Ali MUHAMAD AMEN, a'luniversite de saint- en- Yvelines, 2001,p.143.






(هێلکاری-٢) [123]. MARBEHNAM (ماربهنام)

گۆڕستان- ماڵی شەهیدان- بیت شهداء. A

کەناڵC.

هەیوانی چوونە ژوورەوەB.

کە دەکەوێتە ڕۆژئاوایی (دارا) لە نزیك شاری (نسیبین) و ئەم گۆڕستانە بۆ سەردەمی چاخەکانی مەسیحییەت دەگەڕێتەوەو دیارە سروشتی جوگرافی ناوچەکە یاریدەدەر نەبووە تاکو پارچە زەوی دەست کەوێ بۆ ناشتنی مردووەکانیان، جا لەبەر ئەوە خەڵکەکە ژووری ناشتنیان دروست کردووە بە داتاشینی ئەو بەردە رەقانەی چیا، جا زۆرجار دەرگای ئەم ژوورانە دەنەخشێنراو ناوەوەی ژوورەکەش لە ئاسایی ترین شێوەیدا بە شێوەیەکی چوار گۆشەییە (٢×٢)م و هەموو ژوورێك دەرگای چوونە ژوورەوەی هەیەو لەهەر سێ لا دیوارەکەی تاقی قوڵی تیادا هەڵکۆڵراوە بە شێوەی تابووت کە جێگای ناشتنی مردووەکە بووە، جگە لەو ژوورە ئاسیانەش ژووری تر فراوانتر هەبووە کە چەندین شوێنی لە خۆ گرتووە بۆ ناشتنی مردووەکانیان، هەروەها بەزۆری ئەو مردووانەی کە لە نێو یەك ژووردا بوونە خزم و کەسوکاری نزیکی یەکتر بوونەو شایەنی باسە زۆرجار دەرگاو دیوارەکانی ئەو گۆڕانە بە وێنە دەنەخشێنرا جا بە وێنەی خاچ و فریشتەی باڵدارو مامز ودارو... هتد. کە هەر یەکێکی پیرۆزی و مانایەکی تایبەتی هەبووە. یەکێك لەو ژوورانەی کە بۆ ناشتن دروست کرابوو لەم گۆڕستانەدا لە هەمووی سەرنج ڕاکێش تر بووە چونکە زۆر گەورە بووە، چوار گۆشەیەکی (١٣× ١٣)م کە زۆر

( 123) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥.

بەوردی و بە تەكنيك داتاشراوە چەندەها تاق و چاڵی تيادا بووە بۆ مردوو ناشتن و هەر يەكێك لەو تاقانەی كە لە نێو چينی ديوارەكاندا دروست كراوە درێژايەكەی ١٨٥سم بووەو قوڵايەكەی بۆ ناو ديوارەكە ١١٠سم بووە، جا بەو شێوەيە هەر لا ديوارێكی ژوورەكە چەند چاڵێكی گرتۆتە خۆی بۆ مردوو ناشتن، ديارە دروست كردنی ئەو ژوورو گۆڕانە لە نێو ئەو بەردە ڕەقە كارێكی زۆر وردی پێويست بووە بەتايبەتيش چونكە ئەو كەسانەی ئەم شتەيان دروست كردووە لە چەند ئامێرێكی سەرەتای بەو لاوە هيچی تريان نەبووە.

بەهەر حاڵ ئەوەی كە باسكرا نموونەيەك بوو لە گۆڕستانی سەردەمی مەسيحييەت و ئاساری ئەم جۆرە گۆڕستانەش لە زۆر شوێنی تردا دۆزراوەتەوە بۆ نموونە لە شاری (ئورفە) بە هەمان شێوە گۆڕستان دۆزراوەتەوە كە هی هەمان سەردەم بووە[١٢٤].

نموونەی گۆڕستان و كڵێسەی مەسيحييەكانيش زۆرەو ئەوەی باسكرا تەنها بيرۆكەيەك بوو سەبارەت بەمێژووی گۆڕو گۆڕستان لەلای مەسيحييەكان. لەسەردەمی ئێستادا گۆڕستانی مەسيحييەكان لە زۆر شاری كوردستاندا هەيەو جێگای تايبەتی بۆ تەرخان كراوەو هەندێ جار ئەو شوێنانە دەكەوێتە تەنيشت كڵێسەكانيان وەكو ئەو گۆڕستانەی كە لەتەنيشت (كڵێسە سوور)ە (الكنيسة الحمراء) لە كەركوك و لەم گۆڕستانەشدا جگە لە گۆڕە ئاساييەكان لە نێو چينی ديوار لە ژوورێكی تايبەتيدا شوێن تەرخان كراوە بۆ تابووتی مردووەكان و ئەو خانەوادەيەی ئابووری باش بێت مردووەكەی خۆيان دەكەنە صەندوقەكەوە لە نێو ديوارەكەدا لەسەر يەكتری دايدەنێن و ناو و ڕەسمی مردووەكەشی پێوە هەڵدەواسن. جگە لەوەش گۆڕستانی تر زۆرە، ئێمە بەمەبەستی بينينی شێوازی گۆڕی مەسيحييەكان چووينە گۆڕستانی مەسيحييەكان لە شەقڵاوەو لەدهۆك.

(١٢٤ ) المباني الاثرية في شمال الرافدين في العصور المسيحية القديمةو الاسلامية، ص٦٧.



## شێواز و نووسينی سەر گۆڕی مەسيحييەكان

### شێوازی گۆڕەكان:

وەك ئاماژەمان پێكرد ئێمە بەمەبەستی بينينی شێوازی گۆڕی مەسيحييەكان چووينە گۆڕستانی شەقڵاوەو دهۆك جا چ لە شەقڵاوە يان دهۆك زۆر جياوازی نەبوو لە شێوازی گۆڕەكانيان. بە گشتی مەسيحييەكان بۆ گۆڕ دروست كردن چاڵێك حازر دەكەن بە قوڵايی (١,٥-٢)م و مردووەكە بە تابووتەوە دەخەنە گۆڕەكەو گوڵ فڕێ دەدەنە بانی و گۆڕەكە بە خۆڵ پڕ دەكەنەوە.

گۆڕە ئاساييەكانيان بە چەمەنتۆ هەڵدەنرێ و لەسەر زەوييەوە بە بەرزايی ٢٠سم و پانی ١١٠سم يان زياترو بەدرێژايی گۆڕەكە بە چەمەنتۆ صەب دەكرێ و لەسەر ئەو صەبەوەش پارچەيەك كە لەمەڕ مەڕ يان حلان يا چەمەنتۆ دروست كراوە دادەنرێ كە لەسەری ناوی مردووەكەو ساڵ و ڕۆژی لە دايكبوون و مردنەكەی لەسەر تۆماركراوە ئەوەش چوارچێوەيەكی بۆ دروست دەكرێ بە بەرزايی (١٠سم- ١٥سم) لەسەر صەبەكەوە هەر بە چەمەنتۆو پارچەكەی لەسەر دادەنرێ بڕوانە (وێنە-١)و هەندێ جاريش هەر لەسەر صەبەكە زانيارييەكان تۆمار دەكرێ بڕوانە (وێنە-٢).

جۆرێكی تر لە گۆڕەكان تەنها لەچوار دەورەی گۆڕەكە ديواری بۆ دروست كراوە بە چيمەنتۆ ئەوەش هەر بە بەرزايی ٢٠سم واتە صەبی تەواو نەكراوەو لەلای سەری گۆڕەكەوە كێلێكی بۆ دانراوە وەكو كێلی ئاسايی و نووسينی لەسەر دەكرێ و هەندێ جاريش شێوەی ئەو كێلە لەشێوە ئاساييەكەی لادەدا بە ديكۆری جياواز دروست دەكرێ بۆ نموونە هەندێ جار بە شێوەی خاچە (وێنە-٣)



(وێنه-١) گۆڕستانی مەسیحییەکان- دهۆك/ شێوازی گۆڕە ئاساییەکانیان بە تەنیشت یەکەوە



(وێنه-٢) گۆڕستانی مەسیحییەکان- شەقلاوە





(وێنه-٣) گۆڕستانی مەسیحییەکان- شەقلاوە
وێنەی مردووەکەش لەسەرخاچەکە کراوە

و هەندێ جار گۆڕەکە بە بەرد یان خشت هەڵدەنرێ بە بەرزایی مەترێك یان زیاتر و سەرەکەی بە چەمەنتۆ دەگیرێ و صەب دەکرێ یان بە تاشە بەردی گەورە لە حلان یان بە مەڕ مەڕ دادەخرێ، هەروەها پارچە تابلۆیەکی بەردین وەکو کێل لەسەر گۆڕەکە دادەنرێ و نووسینەکانی لەسەر دەکرێ (وێنه-٤).

دیارە لەلای مەسیحییەکانیش وەکو موسڵمانەکان جیاوازی چینایەتی هەیە بەڵام کەمتر، ئەوانیش گۆڕی ڕەبن و قەشەکانیان و... هتد. جیاوازی هەیە، جگە لەوەش لایەنی ئابووری خانەوادەکەش کاریگەری هەیە بەسەر شێوازی گۆڕەکەوە بۆ نموونە هەندێك لە گۆڕەکان دیکۆرێکی تایبەتیان بۆ کراوە بە شێوەی (محراب) یان (خاچ)ی لەسەر کراوە



(وێنه-٤) گۆڕستانی مەسیحییەکان- دهۆك

و قەفەسی بۆ دروست کراوە بڕوانە (وێنه-٥) و (وێنه-٦) و ئەم بایەخ دانەش بە گۆڕ لە دهۆك زیاتر بوو وەك لە شەقلاوە.

شایەنی ئاماژە پێ کردنە کە زۆربەی گۆڕی مەسیحییەکان لەلای سەرەوە یان لای خوارەوەی گۆڕەکە شوێنێکی تایبەتی هەیە بۆ مۆم داگیرساندن، چونکە ئەوان لە زیارەتی مردووەکانیاندا مۆم هەڵدەکەن. (وێنه-٧).

دیارە مەسیحییەکان ژمارەی شەهیدەکانیان کەم ترە، بەڵام ئەگەر گۆڕەکە گۆڕی شەهید بێ ئەو یان بە شێواز جیایە یانیش بە نووسین واتە بە شێوەیەك بایەخی پێ دراوە (وێنه-٨)، واتە لەلای ئەوانیش پایەی شەهید بڵندەو بەرز ڕایەگرن.

هەروەها هەندێ جار لەسەر کێلەکان وێنەی مردووەکە دەبینین جا یان وێنە کراوە یاخود وێنەیەکی فۆتۆگرافی





(وێنه-٥) گۆڕستانی مەسیحییەکان- دهۆك
شێوازێکی تایبەتییە لە دروستکردنی گۆڕ و هەروەها لە ناو قەفەسە.



(وێنه-٦) گۆڕستانی مەسیحییەکان- دهۆك
شێوازی (محراب)ی کەنیسەی بۆ دروست کراوە



(وێنە-٧)
گۆڕستانی مەسیحییەکان- دهۆك



(وێنە-٨) گۆڕستانی مەسیحیەکان- شەقلاوە
گۆڕی شەهیدێکی شەڕی ئێران و عێراقە



وێنەیەکی فۆتۆگرافی لەسەر گۆڕەکە دادەنرێ بڕوانە (وێنە-٩)، لە گۆڕستانی شەقلاوە شاعیرێکی مەسیحی لێ بوو بۆ ئەم شاعیرەش کێلێکی بەرز دروست کراوە ولە سەرییەوە شێوەی خاچێك هەیەو لەسەر ئەو کێلە وێنەی شاعیرەکە کراوەو دێری شیعریشی لەسەر نووسراوە، بەڵام کێلەکەی لەبەرد دروست نەکراوە بەڵکو بە شێوەی پارچەیەکی پلێتی لاکێشەییە کە چوار دەورەکەی بە ئاسن دروست کراوە. (وێنە-١٠).

سەبارەت بەرەمز لەسەر کێل و گۆڕی مەسیحییەکان هەر لە کۆنەوە وێنە یان شێوەی خاچ رەمزیانەو هەر وەکوو چۆن لە ژیانیانا بەردەوام لەملی دەکەن لە مردنیشدا وێنەی خاچ یان شێوەکەی بەسەر قەبرەکانیانەوەیە (وێنە-١١) (وێنە-١٢).

ئەوانەی باسمانکرد نموونە بوون و چەندین گۆڕی تر هەیە لە شێوەیان لەناو گۆڕستانەکانیان، و نموونەی گۆڕی تریش هەیە کە لە شێوازی دروستکردنیدا هەندێك جیاوازی هەیە لەگەڵ گۆڕە ئاساییەکانیان، بە هەرحاڵ گۆڕی مەسیحییەکان زۆربەی بە چەمەنتۆ هەڵدەنرێ و صەب دەکرێ و هەندێکی کێلی نیەو نووسینەکانی لەسەر صەبەکە دەکرێ و ئەوەی تر کێلی بۆ دروست کراوەو دەکرێ ئەو شێوازی گۆڕهەڵگرتن و کێل دروست کردنە لە میللەتەکانی ترەوە وەریان گرتبێ جا بە هەر چ شێوەیەك بێ هەر خانەوادەیەك بایەخ بە گۆڕی مردووەکەی خۆی دەدا ئەوەی نەبوونیش بێ کەنیسە یارمەتی دەدا لە ناشتنی مردووەکەی و دروستکردنی گۆڕدا.



(وێنە-٩) گۆڕستانی مەسیحییەکان- شەقڵاوە



(وێنە-١٠) گۆڕستانی مەسیحییەکان- شەقڵاوە گۆڕی شاعیرێك





(وێنە-١١)

گۆڕستانی مەسیحییەکان- شەقڵاوە



(وێنە-١٢) گۆڕستانی مەسیحییەکان- شەقڵاوە

## نووسینی سەر گۆڕەکان:

ئەو نووسینانەی کە لەسەر کێل و گۆڕی مەسیحییەکان دەکرێ بەزۆری بریتییە لەناوی مردووەکەو ساڵ و ڕۆژی لە دایکبوون و مردنی و ئەگەر بێت نووسینی تر هەبێ زیاتر چەند ڕستەیەك دەبێ کە لەئەنجیلەوە وەرگیراوە یانیش دوعاکردنە بۆ مردووەکە یا داواکردنی ڕەحمەتە. کەم جار هۆی مردن و پیشەی مردووەکە دەنووسرێ، دیارە سروشتی ئەو نووسینانەش دەگۆڕێ بەتایبەتی ئەگەر مردووەکە لە پیاوە ئایینییەکان بێ جا لەو حاڵەتەدا پلەی ئایینی مردووەکە و سیفاتەکانی دەنووسرێ لەسەر گڵکۆکەی.

ئەو نووسینانەی کە لەسەر گۆڕەکانیان نووسراوە لە ڕابردوودا بە زمانی سریانی بووە، بەڵام ئێستا زۆرجار نووسینەکان بەزمانی عەرەبی دەنووسرێ لەگەڵ سریانییەکەدا.

ئێمە لە میانی گەڕانمان لە نێو گۆڕستانی مەسیحییەکان لە شەقڵاوە و دهۆك چەند نموونەیەکی نووسینی سەر گۆڕەکانمان وەرگرت، بەگشتی هەموو گۆڕەکانیان لەسەری نووسراوە (هنا يرقد على رجاء القيامة) هەر وەك چۆن لەسەر گۆڕی موسڵمانەکان دەنووسرێ (ئارمگای خوا لێ خۆشبوو)، هەروەها ناوی مردووەکانی لەسەرەو ساڵی لە دایکبوون و کۆچکردنەکە، لەلایەکی تر تێبینی ئەوەمان کرد کە مەسیحییەکان شیعر نانووسن لەسەر گۆڕەکانیان و ئەگەر هەبێ زۆر دەگمەنە، لە گۆڕستانی شەقڵاوە تەنها لەسەر گۆڕی شاعیرێك شیعر نووسرابوو بە زمانی کوردی و ئەگەر شیعری تر هەبوو بێت ئەوە چەند دێرێکی شیعر بووە بە عەرەبی نووسراوە، بەڵام نوسینەکانی تر زیاتر دوعایەیان تێکستە لە ئەنجیلەوە وەرگیراوە جا بەر لەوەی ئەو نموونانە بخەینە ڕوو پێمان باش بوو چەند نموونەیەك بهێنینەوە لە نووسینە کۆنەکانی سەرگۆڕی مەسیحییەکان بۆ ئەو مەبەستەش نووسینی سەر (پلاك) (پارچە تابلۆی گۆڕی بەتریارکەکانی) دێری (ربان هرمزد)مان وەرگرت کە دەقەکە لەسریانییەوە کراوە بەعەرەبی. ئێمە پێشتر وتمان ئەو گۆڕانەی (ربان هرمزد) نۆ گۆڕە جا لێرەدا نووسینی سەر دوو پلاك دێنینەوە بە نموونە:

- لەسەر پلاکی هەشتەم کە خاچێکی لەسەر کراوە نووسراوە:

(بسم الحي الذي لا يموت) (بەناوی ئەو زیندووەی کە نامرێ)

لەژێر خاچەکەو لە تەنیشتی ڕاستی:



(ساس كرسي البطريركية العالي ابو نا مستحق البركة ثلاث و عشرين سنة مبارك هو الرب)

و لەلای چەپی خاچەکە/ (ليعمل الرب تذكاراً مقبولاً امامه مستحق لأبننا هذا الطوباوي الذي انتقل على الامل السماوي) و لەژێرەوە نووسراوە: (انتقلت من هذا العالم باشارة العلي وانا منتظر يوم القيامة العظيم حتى يأتي الرب ويترحم على براحمه امين (بتضرع) كل كنيسة مستقيمة... وصل ايها القارئ وتضرع بقلب نقي واطلب واسال من رب ليصفح عن اثامي... ساس وخرم كما يجب ابونا هذا المرحوم المغفور له درجة المطر ابو ليطى العليا سبع سنوات مات وانتقل على رجاء الملك السماوي ابو الطاهر مار ايليا الراعي الطوباوي في سنة ٢٠٣٤ يونانية (١٧٢٣م) في اليوم الرابع عشر من شهر كانون الاول. بنعمة المسيح في جنة الخلود)[١٢٥]. واتە ئەو نووسینە کۆنانەی کە لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە زیاتر تێکستی ئەنجیلە یان دوعایە بۆ مردووەکە، و پلەی ئایینی بەتریارکەکە نووسراوە و ساڵی مردنی و هەروەها لە خوێنەری ئەو پارچەیە داوا دەکات کە دوعا بۆ مردووەکە بکات تاکو (رب) بیبەخشێ لە هەڵکانی و... هتد.

و لە نموونەیەکی تردا بەهەمان شێوە نووسراوە.

نووسین سەر پلاکی نۆیەم/

(بسم الحي الذي لايموت) (بەناوی ئەو زیندووەی نامرێت)

لەژێر خاچەکە نووسراوە/ (الصليب انتصر والصليب ينتصر) (خاچ سەرکەوت و خاچ سەردەکەوێ)

و لەلای ڕاستی خاچەکە/ (ساس وخدم الكرسي البطرسي المجد، درجة الجثلقة البطريركية العليا سنة ٢١٥٥ يونانيية (١٨٠٤م) ليكن ذكره في السما و بين المختارين )

لەلای چەپ/ (ساس وخدم كما يجب ابونا الا قدس ايشو عياب درجة المطربوليطي العليا الموقرة اربع وثلاثين سنة).

لە ژێرەوە نووسراوە/ (صل وطلب ايها القارئ بقلب نقى واسأل وتضرع الى المسيح الرب الحي ليجيز ويمحو ويصفح عن اثامي ويعدنى مع مختاريه ويقيمنى على يمينه في اليوم الاخير...

---

(١٢٥ ) اثر قديم في العراق، ص٤٠.

الملك المسيح يغسل اثامه الخفية والعلنية بطلب كل الكنيسة والشعب المسيحي المستقيم... الخ)[١٢٦].

لێرەشدا کۆمەڵێك نووسین کراوە هەمووی باسی پلەو پایەی مردووەکە دەکات و داوای رەحمەتی بۆ دەکات لەخواو داوا لە خوێنەری نووسینەکەو لەگەڵی مەسیحی و لە کەنیسە دەکات کە دوعای بۆ بکەن لای حەزرەتی (مسیح- رب) کە بیبەخشێ و هەروەها ساڵی مردنەکەی تۆمارکراوە.

**نموونەی نووسینەکانی گۆڕستانی شەقڵاوەو دهۆك:**

– (بسم الاب و الابن و روح القدس)(*).

**(من امن بی یحیا وان مات)(**).**

**(ئەی شاعیری ژوان و ژوانگە بەزێن:**

**وا بەرەو هەڵدێری ژیندا شۆڕ بوویتەوە**

**بوویتە زستانێکی پڕ کڕێوەو**

**گۆڕێکی تەنگ و تاریك**

**بۆتە کاروان سەرات... لەناو فەرهەنگی ڕابردوو ناوت دەبن)**

(هنا یرقد علی رجا و القیامة الادیب الشاعر المرحوم// خلیل بولص بطرس خورانی// ١٩٤٥-١٩٩٩/٦/١٧ صلوا الاجله). گۆڕستانی شەقڵاوە(***).

– (بسم الاب والابن والروح القدس)

**(یا أولادي اینما کنتم اذکروني      (منداڵەکانم لەهەر شوێنێکن یادمکەنەوە)**

**فان ذکرتموني زوروني      کە یادمتان کردەوە وەرنە زیارتم**

(١٢٦ ) اثر في العراق القدیم، ص٤١.

(*) ئەو نووسینەش لەسەر زۆربەی گۆڕەکان دەنووسرێت.

(**) ئەم نووسینەش لەسەر هەموو گۆڕەکان دەنووسرێتەوە.

(***) ئەو گۆڕە تەنها گۆڕ بوو کە لەسەری شیعری کوردی تۆمارکراوەوە گۆڕەکە گۆڕی شاعیرە جا لەبەر ئەوە بایەخی پێ دراوەو شیعری بۆ نووسراوە، و ئەم نووسینانە لەسەر کێلەکەی تۆمارکرابوو.



**وان لم تزوروني فصلو لأجلي)      و ئەگەر نەهاتنە زیارەتیشم نوێژم بۆ بکەن)**

**(هنا یرقد علی رجا و القیامة المرحوم انور جبرائیل بطرس)**

١٩٣٩ توفی في ٢٠٠١/١١/٢١ صلوا لأجله. (گۆڕستانی شەقڵاوە)

– المرحوم صلیوا گورگیس یعقوب صلیوا/ موالید ١٩٢٣

تأریخ الوفاة ١٩٩٠/٨/١٠

**(یا اهلي یا احبائي      انا حي للأحیاء**

**انا في المجد والهناء      لا تنفع الدنیا الغناء**

**جاهدت جدي المسیح      للحق للحب والاخاء**

**وسامی مجد السماء      وفخري عند ابنائي ) (گۆڕستانی شەقڵاوە)**

* دیارە مەسیحییەکانیش کۆمەڵێك دروشمیان هەیە تایبەتی بەخۆیان خۆشەویستی، برایەتی، تەبایی... هتد. جا ئەو دروشمانە لە نێو شیعرەکانیاندا هاتووە، و زیاتر لە شیعرەکانیاندا باسی حەزرەتی مەسیح دەکرێ.

– (هنا یرقد علی رجا و القیامة المرحوم

(یوحنا فرنسی حنا رسام

١٩٤٧-١٩٧٩/١١/١٣

**(عدمت وجودی في الوری بعد بعدکم**

**فان فؤادي لا یحب سواکم**

**خذوا کرماً جسمی الی این ترتموا**

**واین حللتم فادفنوني حداکم**

**وان تذکروا اسمی عند قبری یحییکم**

**انین عظامی عند صوت نداکم) (گۆڕستانی شەقڵاوە)**

* ئەم نووسینانە لەسەر صەبەی گۆڕەکە نووسرابوو.

– صليوا توما صليوا ( † )
**(باسم الاب والابن والروح القدس)**
**(طوبى لأطهار القلوب// فأنهم يشاهدون الله)**
مواليد ١٩٥١... تأريخ الوفاة ٢٠٠١/٥/٢٦. (گۆڕستانی شەقڵاوە)

– (بسم الاب والابن† والروح القدس )
**(طوبي للمساكين بالروح فان لهم ملكوت السماوات)**
**(هنا ترقد على رجا و القيامة المأسوف على شبابها)**
**(بيان كاكو ايليا)**
**ولدت فى ١٩٥٩/٩/١٤- توفيت فى ١٩٨٣/٣/٣١ صلوا الأجلها.**
**(گۆڕستانی شەقڵاوە)**

– (بسم الاب والابن † والروح القدس )
**(يا قارئ كتابى ابك على شبابى بالامس كنت بين اهلى واحبابى واليوم تحت التراب)**[*].
هنا يرقد الشهيد الملازم (سمير توما شابا)
ولد في ١٩٦٦/١٢/١٩ استشهد في قاطع مهران في ١٩٨٨/٧/٣٠ صلوا لأجله (گۆڕستانی شەقڵاوە)

– انا القيامة والحياة من امن بي وان مات فيحيا
**(بسم الاب والابن والروح القدس)**
**هنا يرقد على رجاء المرحوم**
سامی شلیمون اسماعیل
ولد فی ١٥-٢-١٩٩٨ و توفى ٥-١-٢٠٠٤
**(اثر حادث سيارة مؤسف) (صلوا لأجله) (گۆڕستانی دهۆك)**

(*) ئەو دێرە شیعرە لەسەر قەبرەکانی دهۆکیش هەبوو، هەروەها ئەم دێرە شیعرە لەسەر گۆڕی ئیسلامەکانیشدا نووسراوە واتە ئەم دێرە هاوبەشە لە نێوانیان.



* ئەم گۆڕە هۆی مردنی کەسەکەی لەسەر تۆمارکرابوو و مەسیحییەکان زۆر کەم هۆی مردنی کەسەکە دەنووسن لەسەر گۆڕەکانیان.

– بسم الاب والروح القدس
**الا له الواحد امين**
**هنا ترقد على رجاء القيامة الصالحة الام الحنونة المرحومة**
**الشيوع بطرس حكيم**
**ولدت في ١٩٣٤/٧/١ و توفت في ٢٠٠٣/٨/٢٩ صلوا الاجلها (گۆڕستانی دهۆك)**

– (انا القيامة والحياة فمن امن بي وان مات فسيحيا) الشهيد
هنا يرقد على رجا و القيامة المرحوم
**شابى شمعون خنانيشو/ ولد ٢-٣-١٩٦٦ توفي ١٢-٤-٢٠٠٣ صلوا الأجله**
**يا قارئ كتابي ابك على شبابي بلأمس كنت معكم و اليوم تحت التراب (گۆڕستانی دهۆك)**

ئەگەرچی مەسیحییەکان ئایینیان جیایەو داب و نەریتێکی تایبەتی بە خۆیانەوە هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکن لەکۆمەڵگایەکی گەورە جا بێگومان ئەوان کاریگەریان بەسەر کۆمەڵەوە هەبووەو کۆمەڵیش کاریگەری لەسەر ئەوان هەبووە، هەر لەبەر ئەوە دەبینین هەندێ شتی هاوبەش هەیە، وەك دێرە شیعریان هەندێك داب و نەریتی وەك هەڵکردنی بخور، زیارەتی گۆڕستان لەجەژنەکان یان لە دروستکردنی کێلدا جگە لەوەش زیارەتی پیاو چاکان... هتد. جا لەبەر ئەوە ئێمە بە باشمان زانی لە مەڕ داب و نەریتەکانی مردن لەلای ئەوانیش بەکورتی وێنەیەك بخەینە ڕوو، دیارە ئێمە دوو گۆڕستانمان وەرگرت و زیاد قوڵ نەبوینەوە لە داب و نەریتەکانیان بەپێی کەنیسەکان، بەڵام بێگومان ئەگەر گۆڕستانەکانی تریان و مەزار و کڵێسەکانیان بگەڕێین کۆمەڵێك وردەکاری تر دەدۆزینەوە کە باس نەکراوە لێرەدا لەمەڕ دیاردەی مردنەوە.

## ئەنجام

تەوەری سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە تۆمارکردنی ئەو رەمزو نوسینانە بوو کەلەسەر گۆڕەکان دا هەن، و بابەتەکە وای خواست کە سنووری لێکۆڵینەوەکە فراوان بێتەوەو لە ئەنجامدا کۆمەڵێك تێبینیمان لەلا دروست بوو کە لەو خاڵانەی خوارەوەدا کۆمان کردووە:

١- خاڵی دەستپێکردنی ئەم باسە لە هەستکردن بەر گرنگی ئەم بابەتەوە سەری هەڵداو لە ئەنجامدا گەیشتینە ئەوەی لایەنێکی دەوڵەمەند هەیە کە زۆر گرنگیشە فرامۆشکراوە ئەویش جیهانی گۆڕ و گۆڕستانە کە دەکرێ لە چەندین لاوە توێژینەوەی لەسەر بکرێ لایەنی مێژووی و ئاساری و لایەنی هزری کۆمەڵایەتی و داب و نەریتەکان... هتد.

٢- مردن ئەو دابڕانەیە کە چەندین ڕێ و ڕەسم لەگەڵ خۆیدا دێنێ و سروشتی ئەو ڕێ و ڕەسمەش کۆمەڵگاکان دیاری دەکات.

٣- بەهۆی ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان جۆری بیرکردنەوەو تێفکرین و ڕوانینی میللەتەکانەوە هەیە، کۆمەڵێك چارەنووسی جیا جیا بۆ گیان و لەشی مرۆڤ دیاریکراوە لە پاش مردن و لەهەر پارچەیەکی جیهاندا بە شێوازێکی تایبەتی لەگەڵیدا هەڵسوکەوت دەکەن.

٤- بایەخدان بە گۆڕ و گۆڕستان بابەتێکی کۆنەو بەهۆی بوونی بیری زیندووبوونە لە پاش مەرگدا لەڕابردوودا بایەخێکی زیاتر بە گۆڕی مردووەکان دراوەو نموونەی ئەو گۆڕە کۆنانەش زۆرە.

٥- لە ئەنجامی گەڕان بەناو گۆڕستانەکاندا بۆمان دەرکەوت کە هەر سەردەم و شوێنێك کۆمەڵێ شێوازی تایبەتی هەیە لە دروستکردنی گۆڕو دیکۆری گۆڕەکان، و شێوازی دروستکردنەکەیان ڕەنگدانەوەی عەقڵییەتی خەڵکەکەیەو دەکرێ لە ڕێیەوە لە چۆنیەتی بیرکردنەوەی خەڵکەکە بگەین.

٦- هەروەها کاتێ مرۆڤ بێ دەسەڵات وەستا بەرامبەر بە دیاردەی مردن و نەیتوانی هیچ بۆ مردووەکەی بکات ناچار خۆیی دایە گرنگیدان بە شێوازی دروستکردنی گۆڕی مردووەکەی و ئەو بایەخەی بە خزمەت کردنی مردووەکەی داناوە.

٧- گۆڕستان گۆڕی کۆمەڵێ هونەرمەندو ڕووناکبیر و شاعیر و سیاسی... میللەت لەخۆ دەگرێ بۆیە وەکو مۆزەخانەیەکە بۆ مێژوویی مرۆڤایەتی و ناوی ناودارەکانی میللەتی پاراستووە.

٨- لە ناو گۆڕستاندا هونەر بوونی هەیە، لەشێوازی دروست کردنی گۆڕەکان و لە نەخشی سەر کێلەکان و نووسینی شیعر و پەندو... هتد. و هەروەها لە بەکارهێنانی ئەو خەتەی کە نووسینەکانی پێ دەکرێ (خۆش نووسییەکەی)و ... هتد. لەبەر ئەوە گەنجینەیەکی هونەریشە.



٩- تەوەرێکی باسەکە ئەو ڕەمزانە بوو کە لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە جا ئەو ڕەمزە چ کۆن بێت یا نوێ، بەڵام ڕەمزە کۆنەکان زیاتر جێگای بایەخ بوو بەهۆی کۆنیەکەوەی، و بە پێویستی دەزانین لەداهاتوودا توێژەری ئاساری و کۆمەڵایەتی لەم ڕەمزانە بکۆڵنەوە چونکە وەکو بۆمان دەرکەوت هەر ڕەمزێك مەبەستێك دەگەێنێ و ئەو مەبەستەش پەیوەندی بەلایەنی بیرو باوەڕو کەلتوورو مێژووی گەلەکەمانەوە هەیە ئەمە جگە لەو سەنگە هونەرییەیی کە ئەم ڕەمزانە هەیانە.

١٠- هەر لە ئەنجامی ئەم باسەشدا گەیشتینە ئەوەی بڵێین لایەنێکی گرنگ هەیە لەناو ئەدەبیاتدا کە ناکرێ فرامۆش بکرێ ئەوەش ئەدەبی سەر گۆڕەکانە، چونکە ئەو شیعر و پەندانەی کە لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە یەکجار زۆرەو بۆ خۆی ڕەوتێکی سەربەخۆی دەستنیشان کردووەو مەبەستی تایبەتی دەگەێنێ و ئەم مەبەستانەش وێنەی هزرو دەروونی مرۆڤە لە بارەی دیاردەی مردنەوە بۆیە لەم ڕێگایەوە دەکرێ پێناسەیەك بۆ ئەدەبی گۆڕستانەکان بکەین و بڵێین بریتییە لە هەموو ئەو شیعرو پەندە شیعریانەی کە لەسەر گۆڕەکان تۆمارکراوە کە تەعبیر لە هەڵوێست و نەهامەتییەکانی مرۆڤ دەکات یان باسی فەلسەفەی ژیان و مردن دەکات یا پیا هەڵدانە... هتد. بەگشتی ڕەنگدانەوەی لایەنی هزرو لایەنی دەروونی مرۆڤە لەبارەی دابڕان و مردنەوە.

١١- ڕادەی ڕۆشنبیری کاری گەرییەکی زۆری هەیە لەسەر بوونی شیعر لەسەر گۆڕەکان و ئەو ئاستە بۆتە هۆی بوونی جیاوازی لە نێوان گۆڕستانی شارەکاندا.

١٢- میللەتی کورد تەنها میللەت نییە کە نووسینی لەسەر گۆڕەکان کردبی بەڵکو بەر لە ئەو زۆری تر ئەم نەریتەیان هەبووە، و ئەو نموونانەی کە هەیانە لەم بوارەدا بە شێوازێکی جوان ڕێکیان خستووەو لەژێر چەمکێکی ئەدەبی سەربەخۆ کۆیان کردۆتەوە بەناوی (ئیپیتاف) جا ئێستا میللەتی کوردیش کۆمەڵێك نموونەی ئیپیتافی هەیە لە گۆڕستانەکاندا کەچی فەرامۆش کراوە، و بەڕاستیش ئەو نووسینانە بە گەنجینەیەك دادەنرێ یەکەم لەبەر ئەوەی وەکو نەریتێکی لێهاتووەو ئەم نەریتەش هۆیەکی لە پشتەوە بووە، و دووەمیش لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك شیعرە واتە: (وشەیە) زمانە، تەکنیکە، ناوەڕۆکە، و هەردوو هۆیەکەش زادەی هەست و بیرکردنەوەکانی مرۆڤە کەشایەنی بایەخ پێدانە.

١٣- ئەو مەبەستانە کە شیعرەکانی سەر گۆڕەکان دەیگەێنێ جا چ شیعرەکە کێشدار بێ یان ئازاد بێ بریتییە لە: وروژاندی هەستی نەتەوایەتی، لاواندنەوە، یا وەسف و پیاهەڵدانە یا شیعری فەلسەفەیە، و زۆرجار هەوڵدراوە لەم شیعرانەدا بە کەمترین وشە قوڵترین مەبەست بگەینرێ.

١٤- لەگەڵ دیاردەی مردندا لەکۆنەوە کۆمەڵێك داب و نەریت پەیڕەو کراوەو ئەو داب و نەریتەش لەلای هەر میللەتێك بەشێوەیك بووە. ئێستاش زۆر لەو ڕێ و ڕەسمانە دەکرێ و ڕیشەی ئەو نەریتانەش بۆ باوەڕە کۆنەکانی ئەو میللەتانە دەگەڕێتەوە، بەڵام پێشکەوتنی عەقڵییەتی مرۆڤ و گۆڕانی شێوازی بیرکردنەوەی وردە وردە ئەو نەریتانە بەرەو لەناوچوون دەبات و شێوازی هەڵسوکەوتەکان دەگۆڕێنێ، بۆیە جێ بایەخەو پێویستە ئەو ڕێ و ڕەسمانە تۆمار بکرێ چونکە دەبێتە بەشێك لە کەلتووری میللەتەکە.

١٤- کوردستان ئاین و ئاینزای زۆرە جا هەر کۆمەڵێکیش مۆرکی تایبەتی خۆیی هەیە، بەڵام لە هەمانکاتدا لەبەر ئەوەی لەگەڵ یەکدا دەژین لەیەك خاکدا کاریگەریان هەیە بەسەر یەکەوەو لەڕێی و ڕەسم و نەریتەکانیانەوە دەتوانین هێڵەکانی کارتێکردنی ئەو کۆمەڵانە لەسەر یەکتری بدۆزینەوە.

١٥- مەسیحییەکان بەشێکن لە کۆمەڵگای گەورەی ئێمەو لە گۆڕستانی مەسیحییەکانیشدا کۆمەڵێك تایبەتی هەیە لە شێوازی دروستکردن و لە نووسینی سەر گۆڕەکانیان و هەروەها لە هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ دیاردەی مردندا کە هەموو ئەو لایەنانەش فەرامۆش کراوە بۆیە ئێمە پێمان باش بوو هەندێك تێبینی لەسەر ئەوانیش بنووسین تا هەست بە جیاوازییەکانیش بکەین لە نێوان کەلتوورەکاندا، و جۆری بیرکردنەوە تێفکرینان وێنابکەین لەڕێی ئەو هەڵسوکەوتەی کە لەگەڵ دیاردەی مردندا دەیکەن.

١٦- ئەگەر نووسینی سەر گۆڕەکانە یا ڕەمزە یان داب و نەریت و شێوازی دروست کردنی گۆڕەکانە هەموو تەعبیر لە لایەنی ڕۆشنبیری گەلەکەمان دەکات و بەشێکە لە کەلتوور کە ناکرێ فەرامۆش بکرێت، و گرنگی نەدان بە مێژووی کەلتووری نەتەوەییمان زۆر گران دەکەوێت لەسەر داهاتووی مۆزەخانەی ئەدەبی و ئاساری و ڕۆشنبیری نەتەوەکە، چونکە ئەوەی لە گۆڕستانەکاندا هەیە شتێکی کەم نییەو بێ بەها نییە هەتاکو فەرامۆش بکرێت. ڕاستە ژیان و مردن دوو شتی لەیەك جیان و گۆڕستان شوێنێکی چەپە بە نسبەت ژیانەوە، بەڵام ناکرێ دەرگای لەسەر دابخرێت، چونکە مێژوو ئەو کاتە زیندووە کەشتە مردووەکان دەخوێنێتەوە، جگە لەوەی ئەو شتانەی کەدەبینرێت لە ناو گۆڕستان نووسینە ڕەمزە، شێوازی گۆڕەکانە، داب و نەریتە هەمووی دەستکردی مرۆڤەو لەژێر بارێکی تایبەتی لەهەست و سۆز و هەڵوێستەوە سەری هەڵداوە کە دووبارەش نابێتەوە جا لەبەر ئەوە پێویستە فرامۆش نەکرێ تاکو سامانی مێژوویی و کەلتووری و ئەدەبی نەتەوەکەمان لەم بوارەدا بێ بەش نەکەین.



## سەرچاوەکان

**کتێب:**

**کتێبە کوردییەکان:**


١. ئاوێستا، جەلال ئەمین بەگ، چ١،؟، سلێمانی، ١٩٩٩.
٢. پەندی بەراوردکاری، ئا. کریم شارەزا، چاپخانەی سەمیر امیس، بەغدا، ١٩٨٣.
٣. پیرەمێردی نەمر، نووسینی محمد رسول هاوار، چاپخانەی (العانی)، بەغداد، ١٩٧٠.
٤. جیهانی سۆفیا، یوستاین گاردەر، و. بەهرۆز حەسەن، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٥. چوارینەکانی خەیام، و. هەژار، چ٢، چاپخانەی سروش، تهران، ١٩٩١.
٦. دەروازەکانی ئاین لە نێوان زەوی و ئاسماندا، ئا: مەریوان ئەبوبەکر هەڵەبجەیی، ب١، ؟، سلێمانی، ٢٠٠١.
٧. رازی تەنیای
٨. ڕێ و ڕەسمی لاوانەوەی کوردی، د. شکریە رەسول، هەولێر اوفیست، ١٩٩٧.
٩. عەقیدی مرضیە، دانانی سید عبدالرحیمی مەولەوی، شرح و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریم مدرس، مطبعة الخلود، بغداد، ١٩٨٨
١٠. گەران بەدوای نەمرییدا، مەولودی ابراهیم حەسەن، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢.
١١. گوڵچینی دیوانی هەژار و هێمن، هەڵبژاردەی خەلیل ئەحمەدی، انشارات کردستان، ایران، ١٣٨٢ هەتاوی.
١٢. گوندایەتی ئالیکی ئنثرۆپۆلۆجی، کۆمەکرن و بە هەڤکرنا، خدر سلێمان، چاپخانا الحوادث، بەغداد، ١٩٨٥.
١٣. گۆران،(دیوان)، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی محمدی مەلا کەریم، ب١، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٠.
١٤. لە پەندەکانی پیرەمێرد، کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی کاکەی فەلاح، ب٢، چاپخانەی سلمان الاعظمی، بەغداد، ١٩٦٩.

١٥. مەحوی،(دیوان)، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریم مدرس و محمدی مەلا کەریم، چ٢، بلاوکراوەی کوردستان، ایران،
١٦. مەولەوی،(دیوان)، کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عبدالکریم مدرس، چ٢، بڵاوکراوەی کوردستان، ایران، ١٣٧٨ی هەتاوی
١٧. مێژووی مۆسیقای کوردی، محمد حەمە باقی، دەزگای ئاراس، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٢.
١٨. هەنەك كڤنە باوڕێت خەلكی ل بەهدینان، حجی جعفر، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغداد، ١٩٩٣.
١٩. هەولێر كۆمەڵە وتارێكی ڕۆشنبیری شارەوانی هەولێر، ئا. شێرزاد قادر و تەحسین چیچۆ، هەولێر، ١٩٨٥.
٢٠. هێمن موکریانی، (دیوان)، بەسەرپەرشتی سەیران حیکمەت و سەردارو شەمزاو، بلاوکراوەی عێراق- کوردستانی ئازاد- کوردستان، ٢٠٠٥
ڕازی تەنیایی، ئەحمەد هەردی، چ٢، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٤.
٢١. وەلی دێوانە، (دیوان) کۆکردنەوەی مەحمود خاکی، چ٢، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٣.
٢٢. یەزیدیەکان و ئاینی یەزیدی، شاکر فەتاح، ؟، بەغداد، ١٩٦٩.

## کتێبە عەرەبیەکان:

٢٣. القران الكريم
٢٤. اثار بلاد الرافيدين من العصر الحجري القديم حتى احتلال الفارس، ستيون لويد، ت: د. سامي سعيد الاحمد، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٠.
٢٥. اثر قديم في العراق (دير الرهبان هرمزد) گورگيس حنا عواد، مطبعة النجم ، الموصل، ١٩٤٣.
٢٦. انتصار الحضارة (تأريخ الشرق القديم)، جيمس هنرى برستد، ت: احمد فخري، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٦٦.
٢٧. الحياة والموت في الشعر الجاهلي، د. مصطفى عبداللطيف جياوك، منشورات وزارة الاعلام، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧.



٢٨. الاسلام وملحمة الخلق والاسطورة، تركي علي الربيعي، المركز الثقافي العربي، بيروت، ١٩٩٢.
٢٩. المباني الاثرية في شمال بلاد الرافدين في العصور المسيحية القديمة والاسلامية، كونراد بروسير، ت.د. علي يحي منصور، المؤسسة العامة للأثار والتراث، بغداد، ١٩٨١.
٣٠. صحيح فقه السنة وادلته وتوضيح مذاهب الائمة، ابو مالك كمال بن السيد سالم، ج١، المكتبة التوفيقية، ؟، ؟
٣١. طقوس الجنس المقدس عند السومريون، صموئيل نوح كريمو، ط٤، دار علا و الدين للنشر، سورية، ٢٠٠٦
٣٢. كتاب الحياة (العهد الجديد)/ عربي- ئینكليزي، الطبعة الرابعة، ١٩٩٢.
٣٣. موسوعة العقائد والاديان، مازن مغايري، دار الرضوان، حلب، ٢٠٠٤.
٣٤. هوية كركوك الثقافية والادارية، محمد علی قرداغی، منشورات ئاراس، اربيل، ٢٠٠٤.

## گۆڤارەکان:

١. ئەدەبی گۆڕستانەکان، نەوزاد فەرهاد، گ؛ شین، ژ١، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.
٢. ئاینی چەمەری و شیوەن، حەیران لوتفی نیا، گ؛ رامان، ژ٥٥، هەولێر، ٢٠٠١.
٣. ئێزیدیەکان، سدیق بۆرەکەیی، گ؛ رامان، ژ٢٥، هەولێر، ٢٠٠٠.
٤. دەڤەری کەرکوك و ناوچە شوێنەوارەکانی، خالید سابیر، گ؛ رامان، ژ٥، هەولێر، ٢٠٠١.
٥. دوعایا ل سەر گیانێ مری، بەر هەڤکرن شێخ عەلو خەلف، گ؛ لالش، ژ١٩، هەولێر، ١٩٨٩.
٦. شوێنەوارەکانی پەکۆڵی و بەرکەڵ، عبدالرقیب یوسف، گ؛ هزار مێرد، ژ٢١، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٧. سەلاحەدین ئەیوبی خەڵکی دوینی ئەرمەنستانە نەك دوینی هەولێر، عبدالرقیب یوسف، گ؛ هەزار مێرد، ژ١١، سلێمانی، ساڵی شەشەم.
٨. طريقة دفن الموتى في كردستان و جنوب العراق، زبیر بلال اسماعیل، گ؛ شانەدەر، ژ٨، هەولێر، ١٩٩٨.
٩. قەر و گوڵەزەر، عبدالرقیب یوسف، گ؛ رامان، ژ٧٣، هەولێر، ٢٠٠٣.

١٠.قەڵاچوڵان پایتەختی میرنشینی بابان، عبدالرقیب یوسف، گ؛ هەزار مێرد، ژ٢١، سلێمانی، ٢٠٠٢.
١١.کۆمەڵە گۆڕێکی قالیح ئاغا لە هەولێر، شا الصیوانی، گ؛ شانەدەر، ژ٣، هەولێر، ١٩٩٧.
١٢.کێشەی مەرگ لەلای مەولەوی، سروە عوسمان، گ؛ رامان، ژ٩ ، هەولێر،٢٠٠٣
١٣.گۆڕی پیر مەڕوان و نهێنیەکانی، عبدالخالق سەرسام، گ؛ هەولێر، ژ١٣، هەولێر، ٢٠٠١.
١٤.لاواندنەوەی کوردی و دەوری رۆدینکۆ لە تۆمارکردنیدا، جەلال تەقی، گ؛ کاروان، ژ٥١، هەولێر، ١٩٨٦.
١٥.مەرگ و دۆزەخ لە هزرو شارستانیەتی میسۆپۆتامیادا، محمد سلێمان عباس، گ؛ شانەدەر، ژ١٤، هەولێر، ٢٠٠١
١٦.میترا پەرێسیّ مێژوو بیرو باوەڕ، عەلی تەتەر نێروەیی، گ؛ لالش ژ١٣، هەولێر، ٢٠٠٠.
١٧.میترا- میهر- و. لە فارسیەوە دلێر میرزا، گ؛ هەزار مێرد، ژ٢٠، سلێمانی، ٢٠٠٢.
١٨.مێژوو داب و نەریتی مەسیحیەکانی شەقلاوە، ڕزگار شمعون توما، گ؛ ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ٣، هەولێر، ٢٠٠١.
١٩.نهێنیەکانی گۆڕستانی پادشایەتی ئور، تاهیر عوسمان، گ؛ شانەدەر، ژ١١، هەولێر، ٢٠٠٠.
٢٠.هۆشیاری دوای مردن، مارلین شلیتز، و. گۆران صباح، گ؛ کاروان ژ١٧٨، هەولێر، ٢٠٠٤.

**کتابێکی ئینگلیزی و نامەیەکی دکتۆرا:**

1- A Dictionary of literary terms, J.A cuddon, panguin books, U.S.A, 1984.
2- Les e'glises et monasteres du ((kurdistan irakian)) a la veille et au lendemain de li'slam, These de doctorat pre'sentee par Madame Narmen Ali MUHAMAD AMEN, al' univesite' de saint- en- Yvlines, 2001.



**سایتەکانی ئەنتەرنێت:**

1- htt://en.wikipedia.org/wiki/Epitaph#famousEpitaphs.
2- htt://www.m-w.com/dictionary/epigram.
3- http://www.newpotets press.com/Epigram.htm/
4- htt://www.souriana.com/modules/new/aticle.php?storyid=2596.

**چاوپێکەوتنەکان:**

١. لەگەڵ شوێنەوار ناس مامۆستا (عبدالرقیب یوسف) لە سلێمانی ڕێککەوتی ٢٠٠٦/١/١٨.
٢. لەگەڵ مامۆستا (دڵشاد عزیز مارف) قوتابی ماستەر لەبەشی شوێنەواری کۆلێژی ئاداب، زانکۆی صلاح الدین، ڕێککەوتی ٢٠٠٦/٤/٧.
٣. لەگەڵ القس (صتیفان ربان) راعی الکنیسه الکلدانیه (مار یوسف) لە کەرکوک، ڕێککەوتی ٢٠٠٦/٩/٤